سەرنووسەر: پ. د. موحسین محەممەد حوسێن

سکرتێری نووسین: پ. د. عەبدولفەتتاح بۆتانی

<u>دەستەی نووسەران</u>

پ. د. عزەدین مستەفا ڕەسووڵ

پ. د. وریا عومەر ئەمین

پ. د. محەممەد مەعرووف فەتتاح

پ. ی. د. عومەر ئیبراهیم عەزیز

د. ئازاد ئەحمەد مەحموود

م. موئەییەد تەییب

# ناوەرۆك



## القسم العربي:

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ( ئەکادیمی ) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەڕۆك و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێك لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەڕە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێك هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بڵاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەڵام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش Abstract، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەڕۆك و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (Abstract) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێك لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەڕۆك و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی

بڵاوکەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن و ساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵینەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێك لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەڕەچاوکردنی بیرۆکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی داڕشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بڵاوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) وا باشە لێکۆڵینەوەکە لەسەر (CD) تۆمار کرابێت و چوار دانەی ڕاکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بکرێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆری بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەند کرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بڵاویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیرو بۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

# تعليمات النشر
# في مجلة ( الأكاديمي ) الكردية

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كردستان ـ العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعيّن ان يتضمن البحث حلاً لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى.

# التعلميات الخاصة
# بالشكل وترتيب البحث

١ـ يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٢,٥سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣ـ لغة النشر هي اللغة الكردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانگليزية. وتوضع الملخصات Abstracts باللغات الثلاث.

٤ـ يرتب البحث على النحو التالي:

أـ عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يوضِّح الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصّل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥ـ اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس مـن كتـاب: يـدوَّن اسـم المؤلـف. بـدون قلـب الاسـم، عنوان الكتاب بالكامـل، الناشـر، الطبعـة، (عـدا الطبعـة الاولى)، مكـان وتـاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدوَّن اسـم الباحـث، عنـوان البحـث، اسـم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكـون البحـث تحقيقـاً لمخطوطـة تتّبـع القواعـد والمنـاهج العلميـة المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧ـ تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفـاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصـلية دون المساس بها.

٨ـ يستحسن ارسال البحث على CD وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩ـ يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزوِّد الباحث بقرار هيئة التحرير بقبولـه بعـد عرضه على ثلاثة محكّمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠ـ ماينشر في المجلة يعّبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالـضرورة تعـبيراً عن وجهة نظر المجلة.

**هيئة التحرير**

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTERY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair



هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر
نۆ فیسی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی

ژمارە : ٢/ ٨٩٢٩

مێژووی زاینی ٧ / ٥ /٢٠٠٨
مێژووی کوردی ١٠ / ٧ /٢٧٠٨

**بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی**

**ب/ ڕەزامەندی**

**سلاو و ڕێز..........**

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /٣٥٤ لە ٢٠٠٧/١١/١٩ .

دەربارەی ڕەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی/ زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بڵاوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (٨) ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ١/ ٤/ ٢٠٠٨ بەسترابوو. وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ٢٣٥ لە ٢٠٠٨/٥/١٧ بە پەسند کردنی بڕیارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ ڕەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووک .......... **لەگەڵ ڕێزدا**

**هاوپێچ//**

- تێبینیەکان

**د. محمد صدیق محمد**
**سەرۆکی زانکۆ**

**وێنەیەك بۆ//**

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ ڕێزدا .
- نووسینگەی بەڕێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان ..
- لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە .

Kurdistan Regional Government
Presidency of Ministers Council
Ministry of Higher Education
and Scientific Research
Presidency of University of Koya
Office of President



حکومەتی هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە
نووسینگەی سەرۆك

ژمارە: ٧ / ٩٦ / ٢٧٨٩ بەروار: ٢ / ٦ / ٢٠٠٨

﴿فەرمانی زانکۆیی﴾

بابەت / ناساندنی گۆڤار

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :-
ناساندنی ئەم گۆڤارە وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت .

پ. د. خدر مەعصوم

سەرۆکی زانکۆ

وێنەیەك بۆ:

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- ڕاگرایەتی گشت کۆلیجەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org dnya

# گرنگیی ڕۆڵی سەرکردایەتیکردن
# لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت ( لە هەرێمی کوردستان )دا
# لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییە

**م. ی. ئیسماعیل محەمەد خدر شکاك**
**پسپۆڕی زانستی کۆمەڵناسی ـ لە بواری کۆمەڵناسی سیاسیدا**

**پێشەکی**

ئەگەر سەیری مێژووی گەلانی سەر ڕووی زەمین بکەین، بە شـێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆمان بە دیار دەکەوێت، کە دیاردەی سیاسی و کۆمەلآیەتی و بـارودۆخی چەکداری وەك فاکتەرێکی بنچینەییە لە نیشاندان و دیاریکردنی شارسـتانییەت و گرفتەکان و کەلـەپوورو ناسـنامەی گەلـەکان... هتـد، لـە قۆناغـە جیاجیاکـانی مێژوودا کە پێیدا تێپەڕیون. گەلی کـوردیش یەکێکـە لـە نەتـەوەکانی سـەر ئـەم زەمینەو خاوەنی خاك و مێژوو و کەلتوور و شارسـتانییەتی خۆیـەتی. لـەو ڕۆژەی کورد بناغەی بوونی خۆی دامەزراندووە، بۆتە خاوەنی فەرهەنگ و مێژووی خەباتی مان و نەمانی و داکوتانی ڕەگ و ڕیشەی شارستانییەت و مرۆڤایەتی، بەتایبەتیش ڕەگـی شارسـتانییەتی نەتـەوەی کـورد، بڕگەیەکـە درێژەپێـدەر و تەواوکـەری شارستانیەتی مرۆڤایەتییە لەم جیهانـەدا، ئـەم شارسـتانییەتەش دەگەڕێتـەوە بـۆ سەرەتای دەوڵەتی میدییەکان (٧٠٠) ساڵ پێش زایینی، کە درێژەپێدەری مێـژووی نەتەوەی کوردە تاکو ئەمڕۆکە. لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا، لە نـاو میللـەتی کورد گەلێ سەرکردە و زانا و بلیمەت و سوارچـاکی نـاودار هەڵکـەوتوون و نـاو و ناوبانگییان لەکوردستانی گەورە و هەرێم و دەوروبەر و جیهاندا دەنگی داوەتـەوە.

هەروەها چەندین زانا و دانا و شێخ و سەرکردەی هۆز و ئایینی جیاجیا لە ناو نەتەوەی کورد و نەتەوە و گەلانی تری کوردستان بە دیار کەوتوون. زیرەکی و ئازایەتی و بوێری کورد هانی دوژمنانی ئەم نەتەوەی داوە، کە بە چاوێکی دوژمنکارانە بڕواننە گەل و نەتەوەی کورد، بۆئەوەی نەهێڵن کە بە زمانی شیرینی خۆیان بدوێن و بنووسن و یەك بگرن و ببنە پاڵپشت و هاندەری یەکگرتن و مێژووی چارەنووسی ڕۆڵەکانی کوردستان دیاری بکەن و بوونی خۆیان بسەلمێنن. بۆ ئەم مەبەستەش دوژمنانی کوردو داگیرکەرانی کوردستان چاویان بڕیوەتە خێرو بێرو سامانی مرۆیی و ئابووری و خاکی کوردستان. تەنانەت بۆ ماوەی ساتێکی لێدانی دڵیش کۆڵیان نەداوەو لە هەوڵدان و دوژمنکارین، بۆ سڕینەوەی شارستانییەتی کورد و تواندنەوەی مێژوو، گەل و نەتەوەی کورد، ئەو هەوڵە دوژمنکارانەی دوژمنانی کوردستان بووەتە هۆی شێواندنی مێژووی کوردو یەك نەگرتنی کوردو نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردی، بە تایبەتیش لە دوورخستنەوەو ڕاگواستنی کورد ئەمە زیاتر بە دەردەکەوێت. بۆ پاراستنی کوردو بوونی کورد و کوردستان، چەندین کۆڵنەدەرو تێکۆشەر دەست و بازووی پۆلاینی خۆیان هەڵکردووە، بەرامبەر بە دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان بوونە پێشمەرگەی کوردستان. ئەم تێکۆشەرانەش ڕۆڵیان لە بواری خەباتی سیاسی و بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی دەوڵەتدا لە سەرکردایەتیکردندا بە ڕوونی دەردەکەوێت.

**گرفتی لێکۆڵینەوەکە:** کەمی پسپۆڕی شارەزاو بلیمەت و تایبەتمەند لە سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی دەوڵەتی لە هەرێمی کوردستاندا.

**ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:** تیشك خستنە سەر گرفتەکان و شارەزایی پەیداکردن لە ئاستی سەرکردایەتیکردنی بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی دەوڵەتیدا، لە هەرێمی کوردستاندا.

## ناساندنی سەرکردایەتی :

لەبەر جیاوازی و جۆراوجۆری بوارەکانی سەرکردایەتیکردن، دەتوانین بە پێی ئەم بۆچوونانەی خوارەوە پێناسەی بکەین، سەرکردایەتی (کارگێڕی) بریتییە لە گیانی بەڕێوەبردنی گشتی [1]. توانای بەدەستهێنانی هاوکاری و یارمەتیدانی یەکترە، لەنێوان کەسەکاندا، لە ژێر سێبەری سەرۆکێکی دیاریکراودا و، بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و ڕێزلێنان بۆ سەرۆکەکەیان. یان بە واتایەکی تر، توانای کارتێکردن لە ڕەفتاری ئەندامانی گرووپێکی مرۆڤی (لە جەماوەر)، لە پێناوی هاندانیان بۆ کارکردنی هاوبەش و هەرەوەزییەکی بەبەرهەم، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو [2].

سەرۆك: چ سەرۆکی وڵات یا لەشکری یادەزگایی بێت، یان سەرۆکی پارتێکی سیاسی، ... هتد بێت، لە بنچینەدا لە کارو ئەرکەکانیدا پشت بە دەسەڵاتداریەتەکەی دەبەستێت، لە کاتی دەستبەکاربوونیدا، ئەگەر لە لایەن کۆمەڵەکەشیەوە بەسەر گرووپەکەدا سەپابێت.[3] سەرۆك کەسێکی تایبەتمەندی سەرپەرشتکارە، لە جێبەجێکردنی ئیش و کاردا، بە پێی ڕێنمایی بابەتییانە، لە ئاستی سنووری بڕیارداندا، لەگەڵ خۆ تێخزاندن، بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی گرووپ. کە لە سنووری پسپۆڕیەتییەکەیدا یەکە بە یەکە دەردەکەون[4].

---

[1] د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ علم الادارة العامة، مطبعة دار الفكر العربي، الطبعة الخامسة ١٩٧٢ مصر، ص ١٥٧.

[2] نعمة الشكرجي، مدخل في الوظائف الادارية، مطبعة الزمان، بغداد الطبعة العربية الرابعة سنة ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥، ص ٣٣٢.

[3] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة والنشر جامعة الاسكندرية بدون سنة الطبع، ص ١٩٩.

[4] د. عبدالكريم درويش و د. ليلى تكلا، اصول الادارة العامة، ١٩٧٧، ص ٤٠٣.

سەرۆکایەتی: بە پێی بارودۆخی شێوەی ڕێکخستنی دانراوە، بەردەوامبوونی بە سیستەمەکە و بارە فەرمییە دیاریکراوەکەوە بەندە، دەسەلاتەکە بڕیاری سەرۆکایەتییە فەرمییەکە دەدات [٥]. دانانی سەرۆکایەتی بە دامەزراندن یان هەڵبژاردن دەبێت [٦].

سەرکردە: هێزو توانای ئەرك و کارەکان و دەسەلاتەکەی لە ناو کۆمەڵەکەیدا دەبێت، بۆ سەرنجڕاکێشانی لایەنگرانی و بەرزکردنەوەی ورەو گیانی مەعنەوی، پشت بە کارتێکردنی لایەنگرانی و کۆمەڵەکەی دەبەستێت [٧]. سەرکردە، لە مرۆڤێکی ئاسایی و لەو کەس و لایەنگرانەی کە لە گەڵیدان زیاترە، دەتوانێت زیاترو باشترین بەدەستهێنان بەدەست بهێنێت، لەو ڕێکخراوەو ڕێکخستنانەی کاری تێدا دەکات. سەرکردە بەو مرۆڤە دەگوترێ کە ڕۆڵی سەرەکی لە پارتێك یان بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا یان گرووپێکی سەربازی دا، یان...هتد، هەبێت. لەوانەیە لەسەر وشەی سەرکردە ناکۆکییەکی زۆر دروست ببێت، چونکە زۆر جار: (ڕابەر، سەرۆك، لێپرسراو، بەرپرس، بەڕێوەبەر، سەرکردە) ئەمانە هەموویان تێکەڵ بە یەك دەکرێن، ئەگەرچی ئەمانە ناوەڕۆکی جیاوازیشیان هەیەو، لێك جیاکردنەوەشیان ئاسان نییە. بەلاّم چەند پێناسەیەکی جۆراوجۆر لەم بوارەدا هەن، پێویستە تیشکێك بخەینە سەریان، چونکە سەرکردایەتی بە چەندین شێوە پێناسەی بۆ کراوە. توێژەریش بە پێویستی زانیوە، تەنها چەند نموونەیەك لەم بوارەدا دیاری بکات و ئاماژەی پیّ بکات. وەکو:

---

[٥] نفس المصدر، ص ٤٠٣

[٦] د. نبيل عبدالهادي، علم الاجتماع التربوي، دار اليازوري العلمية للنشر والتوزيع عمان الاردن، الطبعة العربية الاولى ٢٠٠٢، ص٢٠٦.

[٧] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق ص ١٩٩.

١- پێناسەی کارگێڕی خزمەتگوزاری شارستانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (U. S. A) یە کە بەمانای: تایبەتمەندی کارتێکردنی کاریگەر، لە چالاکی گرووپدایە، لە ئاراستەکردنیان بەرەو ئامانج، بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پێویستی بەهەوڵدانە.

٢- پێناسەیەکی قوتابخانەی پیادە دەڵێت: کارتێکردنێکی هونەرییە لە کەسایەتییەکاندا، ئاراستەکردنیان بە ڕێگایەکی دیاریکراو، تاکو لەم ڕێگەیەوە لایەنگرانیان و گوێڕایەڵیان، ڕێزلێنان و پشتگیری هاوکارانیان، بۆ گەیشتن بە ئامانجی دیاریکرا و بۆ خۆیان ڕابکێشن.

٣- پێناسەی هەریەکە لە (John Pfifner & Robert Presthus جۆهن پفیفنەر و ڕۆبەرت پریزیوس) ڕێکەوتنێکی هەماهەنگی هونەرییە، لەنێوان تاکەکان و گرووپەکاندا، کۆکردنەوە (گردبوونەوە)شی بە مەبەستی بە ئاوات و بە ئامانج گەیشتنە)[٨].

لە لایەکی ترو پێناسەیەکی تردا: سەرکردایەتی بریتییە لە توانایەکی سەرکەوتوو، لە ئاراستەکردن و ڕێکەوتنی ڕێگایەکی هاوڕێك، لە چاودێریکردنی کەسانی تر، بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجی گشتی، بۆ ڕێکخراوەکە. ئەمەش لەڕێگای کارتێکردنی لایەنگران، کە بەدوای سەرکردەکەیانەوەن، لە ڕەزامەندی و ڕازیبوون، یان بە بەکارهێنانی دەسەڵاتی فەرمی لە کاتی پێویستدا[٩].

سەرکردایەتی (القیادە): هونەری کارتێکردنی ڕەفتاری مرۆڤانەیە، یان کارتێکردنێکی هونەرییە، لە ڕەفتاری مرۆڤایەتیدا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی

---

[٨] د.عبدالکریم درویش، لیلی تکلا، اصول الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٣٩٩

[٩] د.ابراهیم عبدالعزیز شیحا، الادارة العامة، المصدر السابق، ص١٩٩. بڕوانە هەمان دانەر: د. ابراهیم عبدالعزیز، الادارة العامة، دار الجامعة للطباعة والنشر سنة ١٩٨٣، ص ٣٠٩ .

گرنگ، بەو شـێوە و جـۆرەی سـەرکردەکە ئـارەزووی دەکـات[١٠]. سـەرکردایەتی ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتییە، سەرۆك، لەکاتی تێکـەڵبوونی لەگـەڵ تاکـەکانی گرووپـدا سـەرکردایەتی دەکـات، ئـەوەی ئـەم ڕۆڵـە دەبینێـت، دەبێـت هێـز و توانـای کارکردنەسەر خەڵکی تری هـەبێت. ڕەفتاریـان بەئاڕاسـتەی ڕێگـەی گەیـشتن بـە ئامانجەکانی گرووپ بێت. سەرکردایەتی: شـێوەیەکە لـە شـێوەکانی تێکـەڵبوونی کۆمەڵایەتی، لە نێوان سـەرۆك و لایەنگرانیـدا، کـە پاشـتر بەرزکردنـەوەی نـاوی سەرکردایەتی و لایەنگرانیەتی[١١]. سەرکردایەتی: پرۆسـەیەکە کـار لـە ڕەفتـاری تاکەکان و گرووپەکان دەکات و هانیان دەدات، لە پێناوی ئارەزوومەندی، لـە کـار کـردن، بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجـە دیاریکراوەکـان. سـەرکردایەتی: پرۆسـەیەکی کارتێکردنی تاکەکانی گرووپە، کە دەبێتـە هـۆی کۆکردنـەوەی تواناکـان و بـەرەو ئاڕاسـتەکردنی چـالاکییەکان و پاراسـتنیان، بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجـەکانی گرووپ[١٢]. سەرکردایەتی: توانای تاکە لە کارتێکردنی کەسێك یان گرووپێـك بـە ڕووکارکردن و ڕابەرایەتیکردنیان، لە پێناوی هێنانە ڕیز و هاوکـاری و پاراسـتنیان لەسەر کارەکان، بـە بـەرزترین پلـەو توانـا لـە ڕێگـای بـە دەسـتهێنانی ئامانجـە دیاریکراوەکاندا[١٣].

---

[١٠] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، دار الشروق للنـشر والتوزيـع، عمـان الاردن، الطبعة العربية الاولى ٢٠٠٣، ص ٤٧.

[١١] صـالح محمـد علـي، سـايكولوجية التنـشئة الاجتماعيـة، دار المـسيرة للنـشر والتوزيـع والطباعة، عمان ـ الاردن الطبعة الثالثة ٢٠٠٢، ص١٦٠ـ١٦١.

[١٢] د. عمر احمد همشرى: التنشئة الاجتماعية للطفل، دار الصفاء للنشر والتوزيـع، عمـان الاردن، الطبعة الاولى ٢٠٠٣، ص ٢٥٥، ص٢٥٦.

[١٣] صالح محمد علي، سايكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص ١٦٠.

زانایان پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ چەمکی سەرکردایەتی کـردووە لەوانـەش: ( سـۆتگدل Sotgdill ١٩٥٠) دەڵێـت: سـەرکردایەتی پرۆسـەی کارکردنـە سـەر چالاکی گرووپە، بۆ ئامادەکردن و بە ئامانج گەیشتن. بەلاّم تانبوم و ماسارك پێیان وایە: پرۆسـەیەکی کارتێکردنـە لـە نێـوان کەسـایەتییەکاندا، کـە بـە ئاڕاسـتەی کردارەکانی گەیشتن و گەیاندنە، لە پێنـاوی بەدەسـتهێنانی ئامـانجی گـشتی یـان ئامانجی تایبەتیدا. ئەگەرچی (هولاندزو جولیان ١٩٦٩) پێیان وایە: سەرکردایەتی نواندنی پەیوەندی کارتێکراوە لە نێوان دووکەسدا، یان زۆرتـریش لـە دوو کەسـدا، ئەوانەی پشت بە یەکتری دەبەسـتن، لـە هەڵوێـستی گرووپـدا، بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامانجەکانی دیاریکراو. هەروەها (فیدلر١٩٦٧) دەڵێت: سـەرکردایەتی بـە مانـای چالاکییەکی دیاریکراوە، کە کەسێك ئەنجامی دەدات، لە فرمـان و پـشت بەسـتن، بەئەندامانی گرووپ لە کارەکانیاندا، کە ئەنجامی دەدەن. بە گشتی سـەرکردایەتی بریتییە لە پرۆسەی کارتێکردنی ڕووبەڕوو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان[١٤]. بـەلاّم (هیمان) دەڵێ: سەرکردایەتی پرۆسەیەکە تاکێك دەتوانێ ئاراستەکانی و ڕابەرایەتی و کارتێکردن و کۆنترۆڵی هەست و بیر و ڕەفتـاری کەسـانی تـر بکـات. هـەروەها (تۆماس جۆردان) دەڵێت: پیشەیەکە لە پیشە جیاکەرەوە و تایبەتمەندی وەرگرە بـە شارەزایی و فێربوون[١٥].

پێناسەی زانایان هەر یەکە لـە: (کـۆنتز) دەڵێـت: سـەرکردایەتی پرۆسـەیەکی کارکردنەسەر خەڵکێکە بۆ بە دەستهێنانی ئامانجەکان بە ورەیەکی بەرزو پڕ بـڕواوە پێکەوە کار دەکەن. (لیکریت)یش دەڵێت: سەرکردایەتی بریتییە لە جێبەجێکردنی

---

[١٤] محمود سید ابو نیل، علم النفس الاجتماعي، جزء الثاني، الطبعة الرابعة، مصر١٩٨٥، ص ٣٢٢.

[١٥] صالح محمد علي، سایکولوجیة التنشئة الاجتماعیة، مصدر السابق، ص١٦٠ .

کارەکان و یارمەتیدانی گرووپدا، بۆ بەدەستهێنانی باشترین ئەنجام[16]. (بیگۆر ١٩٣٥) یش بەم شێوە پێناسەی دەکات: جۆرێکی پەیوەندییە لەنێوان کەسێك و ژینگەکەیدا، کە توانایی و هەست و دووربینینی هێزێکی پاڵنەر بێت، بۆ زاڵبوون بەسەر تاکەکانی گرووپی تردا، لە هەوڵدان و بەدەستهێنانی ئامانجی هاوبەشدا[17]. سەرکردایەتی راستەقینە: هەستکردن و دەربڕینی داواکارییەکانی گرووپە، هۆکارێکی بەدەستهێنانی کۆکردنەوەی هێزی تاکەکانە لە بەدەستهێنان و هەوڵدانێکی ڕەوادا[18]. سەرکردایەتی بە مانای ئاوێتەبوونی سەرکردەو لایەنگرانیەتی لە ڕووی پێویستییەکان و ئاراستەکردن و گیروگرفتەکانیاندا، لایەنگران وگرووپیش لە ڕووی دروستکردنی پەیوەندییەوە، لەنێوان تاکەکانیدا و تایبەتمەندییەکانیان و هەڵوێستەکاندا کە بەرەو ڕوویان دەبنەوە. ئەمانە هەموویان لە هەستکردنی سەرکردە خۆیەتی، هەستکردنی ئەوانی تریش بۆی، هەستکردنی هاوبەشی لەنێوان سەرکردە و ئەوانی تر، بۆ گرووپ و هەڵوێستیش دەگەڕێتەوە[19]. لە نێوان سەرۆك و سەرکردەدا جیاوازی هەیە. چونکە سەرۆك لە لایەن خەڵك یان سەرکردەکان هەڵدەبژێردرێت، یان خۆی دەسەپێنێت، هەریەکە و دەسەلآت و هێزو توانای جۆراوجۆرو جیاوازی خۆی هەیە. هەندێك تێرم لە بوارێکی فراوانی سەربازی و شارستانیدا تێك هەڵکێشراون و بەکاردێن، لەوانەش وەك تێرمی کارگێڕی (Management) سەرکردایەتی (Leadership)

---

[16] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، دار العلمية الدولية، الطبعة الاولى، عمان ـ الاردن، ٢٠٠٣ص ١٢٠.

[17] د. نبيل عبدالهادى، علم الاجتماع التربوي، مصدر السابق، ص ٢٠٦.

[18] د. عمر احمد همشري: التنشئة الاجتماعية للطفل، مصدر السابق، ص ٢٥٦

[19] د. عبدالله الخريجي، التغير الاجتماعي والثقافي، سلسلة دراسة في المجتمع العربي السعودي، كتاب الثاني عشر، رامتان، جدة ـ المملكة العربية، السعودية الطبعة الاولى ١٩٨٣، ص ١٨٣.

فەرماندەیی (Command). سەرکردەو فەرماندە هاوشێوەی یەکترین لە بـواری سەربازیدا، بەڵام لە بواری شارستانی و مەدەنیەتدا لە نێوانیاندا جیـاوازی هەیـە. بەگشتی وشەی فەرماندە (Commandor) بەکار دێت لە بواری سـەربازی لـە جیاتی وشەی (Manager) بەڕێوەبەر، کـە بـەکار دێـت لـە بـواری، کـارگێڕی شارستانی و مەدەنیەتدا[٢٠].

فاکتەرە گرنگەکان کە نیشانەی دەرکـەوتنی هـەر سـەرکردەیەك دەردەخـەن بـریتین لـە (هێـز و توانـای کەسـێتی سـەرکردە خـۆی و کەسـایەتی و بـوارە ڕەخساوەکەی. بۆچوون و پیشە بنچینەییەکەی لـە بەڕێوەبردنـدا، بـیرو بۆچـوون و ڕوانگەکەی، لە بەڕێوەبردنی کارەکانی خەڵکی تردا. شارەزایی و لێك حاڵیبوون لـە بەڕێوەبردندا.) مرۆڤ تەنها بە زیرەکی ناشێت بکرێتە سەرکردە، بەڵکو ئەو کەسـانە ئەبن کە هێزو تواناو هەستێکی بەرزیان هەبێت و زیرەك بن و گرنگی بە ناساندن و ڕەزامەندی خەڵکی تر بـدەن. مرۆڤـی خـۆ پەرسـت و خۆخـۆیی، بـۆ سـەرکردە و پێشەوایی ناشێت، چونکە ئامانجەکان لە ڕێگـەی هاوکـاری و هەماهـەنگی دێنـە ئەنجام[٢١]. مرۆڤی تەوەزەل و خۆپەرست و سست ناشێت بکرێتە سەرکردە، بـەڵکو مرۆڤێکی چالاك و نیشتمان پەروەر و دڵسۆز، ئەو ئەرکە لە ئەستۆ دەگرێت[٢٢].

سەرکردایەتی پڕۆسەیەکە لە ئەنجامی پێشبڕکێی، ژمارەیەك لـە کەسـانی جۆراوجـۆر دەردەکـەوێت[٢٣]، هـەڵقولاوی تێگەیـشتنی نـاو گرووپـە، سـەرکردە دەسـەڵاتەکەی لـە

---

[٢٠] (هیز، صامویل، وتوماس، ولیم)، تولي القيادة: فن القيادة العسكرية وعلمها، ترجمة سامي هاشم، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، لبنان، ١٩٨٣.)

[٢١] بڕوانە : نعمـة الـشكرجي : مـدخل في الوظـائف الاداريـة، المـصدر الـسابق، ص ٣٣٣، ص٣٣٤ .

[٢٢] بڕوانە : هەمان سەرچاوە، ص ٣٣٣

[٢٣] د. نبيل عبدالهادي، علم الاجتماع التربوي، مصدر السابق، ٢٠٠٢، ص ٢٠٦.

کردەوەکانییەوە وەردەگرێت، ڕەفتارەکانی بە توانای کارتێکردنی لە خەڵکی ناو گرووپەکەی بەندە، بەو ڕێگەیەی کە دەبێتــە یاریــدەدەر، بــۆ بەدەســتهێنانی گوێڕایــەڵی لایــەنگران و وەلاّمدانەوەیان بۆی[٢٤]. ئەو کەســانەی کــە بەهرەمەنــدی و زیرەکییــەکی سروشــتی بــێ هاوتایان هەیە، بە دەگمەن دەیانبینین لە سەنتەرەکانی سەرکردایەتیدا بن، بــەڵکو زۆربــەی هەرە زۆریــان، لــە کــاری پــسپۆڕی و بــوارە زانــستییەکاندا کــار دەکــەن، نموونــەش وەك زانستەکانی: (کیمیا، فیزیا، بیرکاری، پزیشکی ...هتد) بەلاّم ئەو کەسانەی بەهرەمەنــدی و زیرەکی بەرزیان هەیە، ئەوانە باشترین ئەو کەسانەن لە سەنتەرەکانی سەرکردایەتیدا کــار بکەن، ئەگەر هێز و توانا و لێهاتوویبان هەبێت و بە شارەزایی پێویست دەوڵەمەند کــرابن. لە سەرکردایەتیکردندا پێویستە بەرژەوەندی گشتی، لە ســەرووی هــەموو بەرژەوەندییــەك بێت، تا دەگاتە لە بیرکردنی خودو توانەوە لە ناو گشتدا[٢٥].

بە پێی بیروبۆچوون و ناساندنەکانی سەرەوە دەتوانین بڵێین کە:

سەرۆك: کەسێکی تایبەتمەندەو لە کــاتی تێکــەڵبوونی لەگــەڵ تاکــەکانی گرووپــدا سەردارەتییان دەکات، لەلایەن جەماوەر یان سەرکردەکان هەڵدەبژێردرێت، یان خۆی دەسەپێنێت. مرۆڤی خۆپەرست و خۆخــۆیی بــۆ ســەرۆك و پێــشەوایەتی ناشــێت، بەڵکو مرۆڤی چالاك و نیشتمانپەروەر و دڵسۆز ئەو ئەرکە لەئەستۆ دەگرێــت، کــە پێی بگوترێت سەرۆك، دەســەلاّت و هەڵــسوکەوت و جوولانــەوە و فرمانەکانیــشی بەپێی سیستەمەکە و دەسەلاّتە فەرمییەکەیەوە بەندە.

[٢٤] عبدالكريم درويش و د. ليلي تكلا، مصدر السابق ١٩٧٧، ص ٤٠٣.

[٢٥] بڕوانە : نعمة الشكرجى : مدخل في الوظائف الادارية، مصدر السابق، ص ٣٣٣

سەرۆکایەتی: بە پێی باری سیستەمەکەو بارە فەرمییەکەو لـە بـارودۆخی شـێوەی ڕێکخستن دیاری دەکرێت دەسەلاتەکە بڕیـاری سـەرۆکایەتییە فەرمییەکـە دەدات، دانانی سەرۆکایەتیش بە دامەزراندن یان هەڵبژاردن دەبێت.

سەرکردە: مرۆڤێکە کـە ڕۆڵـی سـەرەکی لـە ڕێکخراوێـك، یـان دەزگایـەك، یـان گرووپێك، هۆزێك، دەوڵەتێك، یـان نەتەوەیـەك دەبینێـت. هێـزو توانـای ئـەرك و کارەکان و دەسەلاتەکەی لە ناو کۆمەڵەکەیدا دەبینێـت. سـەرکردە لـە مرۆڤێکـی ئاسـایی زیـاترە، کـە ڕۆڵێکـی تایبـەتی لـە دەسـەلاتەکەی و لـە کردەوەکانیـەوە وەردەگرێت. ئەو کەسانەی کە بەهرەمەندو زیرەکن زیرەکیی سروشتیی بێ هاوتایان هەیە و خزمەتی نەتەوە و گەل بکەن، بە دەگمەن دەبنە سەرکردە.

سەرکردایەتی: پرۆسەی کارتێکردنی جەماوەرە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیە لە لایەنگران و جـەماوەر بـۆ گەیـشتن بـە ئامانجـەکان، ئـەویش لـە ڕێگـەی توانـای تاکـەکانی سەرکردایەتییە لە کەسێك یـان گرووپێـك بـە ڕووکـارکردن و ڕابەرایـەتیکردنیان، ئەمەش شێوەیەکە لە شێوەکانی تێکەڵبوونی کۆمەلایەتی لەنێوان سـەرکردایەتی و لایەنگرانیانـدا، کـە کـارتێکردنێکی هونەرییـە لـە ڕەفتـاری مرۆڤایەتیـدا بـۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و ڕازیکردنی جەماوەر، لە ئەنجامی پێشبڕکێی ژمارەیەك لە کەسانی جۆراو جۆر دەردەکەوێت، لـە جێبـەجێکردنی کارەکـان و یارمەتیـدانی جـەماوەر، لـە ڕێگـەی هەسـتکردن و دەربڕینـی داواکارییـەکانی گـرووپ، بـە ئاوێتەبوونی سەرکردە و لایەنگرانیشەوە.

## باسی یەکەم : سەرکردایەتی

چالاکی سەرکردایەتی لە ڕاستەقینەدا هەڵقوڵاوی ئێستای ژیانە، کە ئێمە تێیدای دەژین، ئەوانی تریش تێیدا دەژین، وە ئەوانەی پێش ئێمە ژیاون و لە دوای ئێمەش دەژین. ئەمە واقعی ژیانە و مرۆڤ لە هەموو شوێنێك و کات و ساتێکدا ژیاوەو لە ناو کۆمەڵگاشدا دەژیت، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بە تەنیاو بێ هاوکاری و یارمەتیی یەکتر ژیان بباتە سەر، بەڵکو پێویستی ژیانە کە لە کۆمەڵگاکەیدا پێکەوە بژین. مرۆڤ ناتوانێت بە تەنیا ئارەزووەکانی تێر بکاو پێداویستییەکانی پڕبکاتەوە، بەڵکو پێویستی بە هاوکاری و یارمەتی تر هەیە لە وەرگرتن و پێداندا، چونکە ژیان بریتییە، لە وەرگرتن و پێدان. هاوکاری پێویستی بە سیستەم و گوێڕایەڵییە، بوونی مرۆڤ لە ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، وا پێویست دەکات کە تاکەکان هاوکاری و هەرەوەزی یەکتری بکەن، بە مەبەستی هاوکاری و هەرەوەزی و بەشداریکردنی مرۆڤ لەگەڵ یەکتریدا، پێویستە قوربانی بە هەندێك لە سەربەخۆیی و ئازادییەکانی بدات، بۆ ئەوەی کۆمەڵگا گشت ئامانجەکانی بەدەست بهێنێت. هەر لەم ڕێگەیەوەش مرۆڤ ئامانجەکانی بەدەست دەهێنێت. ئەمەش پێویستی بە هەرەوەزییە، هەرەوەزیش بەم ڕۆڵەی خۆی، پێویستی بە کارگێڕی و ڕێکخستنە، ئەگینا هەر یەکەو بە شێوەو بارێك کاری خۆی دەکردو ڕووی لە لایەك دەکرد، کە دەبووە بەرەڵایی و بزربوونی ئامانجەکان . وە مرۆڤ لەو کاتەی کە پێکەوەش دەژین، پێویستییان بە یەکێك هەیە، کە شارەزاو ڕێبەری بێت و سەرکردایەتی بکات. سەرکردایەتی زۆر ئاسان نییە، بۆ دانان و دیاریکردنی، لەبەر فراوانی بازنەی ئەم چەمکەو، گۆڕانکارییەکانی لە لایەك و جۆراوجۆری هەڵوێست و بوارەکانی بەکارهێنانیشی لە لایەکی تردا. سەرکردایەتی تەنها لایەنی سەربازی و لەشکری نییە، بەڵکو لە بوارەکانی تریشدا بەکار دێت لە دامودەزگاکانی دەوڵەتیدا وەك: کۆمەلایەتی، پەروەردە، پیشەسازی، رامیاری، بەڕێوەبردن و کارگێڕیشدا .

## یەکەم: گرنگی سەرکردایەتی

سوود وەرگرتن لە هەوڵ و کۆششی سەرکردایەتی بۆ ڕزگاری و سەربەخۆیی کوردستان و بە دەستهێنانی مافی چارەی خۆنووسین و سەرکەوتن لە بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی دەوڵەتیدا، لێرەدا یەکێ لە گرنگترین هۆو هۆکارە چارەنووسسازەکان لە پرۆسەی ڕزگاری و سەربەخۆیی هەر گەل و نەتەوەیەك، سەرکردەو سەرکردایەتییە، چونکە هاوپەیوەندییەکی توندوتۆڵ و گرێدراوی بەسەرجەم فاکتەر و هەل و مەرجەکانی ترەوە هەیە. نرخ و سەنگی ڕۆڵی هەر سەرکردەیەك و سەرەنجامی خەبات هەر بە تەنها لە سەرکەوتن و ڕزگاری و گەیشتنە ئامانجدا نییە. هەر ئەم لایەنە بە تاکە پێوانە ناژمێردرێت، بەڵکو هاوشان بەوە لە پێچەوانەکەشیدایە و لە ساتەکانی نوشستی و شکستیدایە کە لە بەردەم یان لە ناو کارەساتی ژێرکەوتن تا چ ڕادەیەك گەل لە سەرەنجامی بارودۆخەکەو لە کارەسات و نەهامەتی ناو کارەساتەکە سەرفراز دەکرێ وزە و هێزو توانای لە تێکو پێکشکان لادەدرێ و بۆ هەل و دەرفەتی تر دەپارێزرێ[٢٦].

زانایانی دەروونناسی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەوە کۆکن کە سیفاتی سەرکردایەتی بە شێوەیەکی گشتی دیاریکراو نییە. سەرکردایەتیکردن بە مانای ڕۆڵێکی دیاریکراوە لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا جۆرێکی تایبەتی لە جەماوەر و گیروگرفت و بارودۆخ لە خۆ دەگرێت. سەرکردەیەکی هەڵبژێردراو بەشداری دەکات لەگەڵ ئەو لایەنگرانەی کە هەڵیان بژاردووە. لە زۆرترین سیفات بە تایبەتیش ئەوەی گرنگی هەیە لە نێوان سەرکردەو لایەنگران بە تایبەتیش لە بنەماو بنچینە

---

[٢٦] مەحمودی مەلا عزەت، جەمهوریەتی کوردستان، دەزگای بلاْوکراوەی چاپ و پەخشی سەردەم. چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ١٩٠.

کۆمەڵایەتییەکانـدا[٢٧]. بـەڵام سـەرکردەی دانـراوی دامـەزراو، هەڵوێستەکەی، چونکە پێویستە خزمەتی مەبەستە دانراوەکە بکات. لەهەمان کاتیشدا ناتوانێت گرووپەکە بە ئارەزووی خۆی بەڕێوە ببات، تاکو گرووپەکە هەست نەکەن کە ئەم کارو بەڕێوەبردنە لە خزمەتیاندایە و خزمەتی مەبەستەکەیان دەکات .

هیچ کاتێك وەکو سەردەمی ئەمڕۆکە گرنگیدانی زۆر بە سەرکردایەتی دەرنەکەوتووە، ئەمەش لەبەر پێویستییەکانی ژیانە کە ناتوانرێت دابین و چارەسەر بکرێن، جگە لە کاری هەرەوەزی و گەلکاری نەبێت لەم چەرخەدا[٢٨]. لەم کات و ساتەی ئەمڕۆی جیهاندا ململانێ لەنێوان گرنگیدان بە رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا هەیە، سەرکردەکان لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی بنچینەیی دەگێڕن و چارەنووسی مرۆڤایەتی تا ڕادەیەك بە تێکەڵاوی و ئاوێتەبوونی گەلان لە هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانیاندا دەبەستنەوە[٢٩]. پسپۆڕەکانی لێکۆڵینەوەی دەروونی و کۆمەڵایەتی و کارگێڕی گرنگی ڕادە بەدەر، بە بابەتی سەرکردایەتی دەدەن . لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:[٣٠]

سەرکەوتن یان شکستهێنانی هەر ڕێکخراوێك، گرووپێك، دەزگایەك، لەسەر سروشتی سەرکردایەتی و جۆری سەرکردایەتییە پەیڕەوکراوەکە بەندە .

---

[٢٧] دكتور عبدالكريم درويش، دكتورة ليلى تكلا: اصول الادارة العامة، المصدر السابق، ص٤٠٦، ص٤٠٧.

[٢٨] صالح محمد علي ابو جادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص١٦٣ .

[٢٩] د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادة، العراق جامعة الموصل مؤسسة دار الكتب للطباعة والنشر، ١٩٨١، ص ٥٢.

[٣٠] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٤٨ ص ٤٩

سەرکردایەتی کار لەسەر رەفتارو بۆچوونەکان و هەوڵدانی تاکەکان دەکات، ئەمەش یاریدەدەرە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، بە تایبەتیش لە کاتی تەنگوچەڵەمە دژوارەکاندا .

لەبەر پێویستی کۆمەڵگاکان بەسەرکردەی باش، کە توانای رێکخستنی کار و دەزگاکانی هەبێت، هەروەها شارەزایی تەواوی ئەو گرفتانەی لە ناسین و دیاریکردنی گرفتەکان هەبێت، کە تووشی سەرکردەکان دێت و دەبنە رێگر لە ئەنجامدانی ئەو چالاکیانەی، کە پەیوەندیدارە بە ژینگەی کارکردنیان، سیستەمەکانیان، هەروەها ئەو گرفتانەی کە تووشی تاکەکانی کۆمەڵ دەبن وەك: لایەنی دەروونی، تەندروستی، لەش ساغی سەرکردە، کە ئەمانەش دەبنە یاریدەدەرو باگراوندێك بۆ گرفتەکان و شێوەی چارەسەرکردنیان .

رۆڵی سەرکردە لە هاوبەشیکردنی گرووپدا، کاتێ تەنگژە ترسناکەکان هەرەشەی لێ دەکەن. لێرەدا رۆڵی سەرکردە دەردەکەوێت لە یارمەتیدانی گرووپەکە، لەسەر تێگەیشتنی تەنگژەکەو، شیکردنەوەو دانانی چارەسەری گونجاو، وە رزگاربوون لە پاشماوە خراپەکانی سەر کۆمەڵگا. بۆ پاراستنی گرووپ و کۆمەڵگا، لەسایەی سەرکردایەتییەکی بە هێزو یەکگرتوو، وە لە زۆر کاتدا روودانی تەنگژەکان، بوونەتە هۆکارو یارمەتیدەری دەرکەوتنی سەرکردەیەکی تر. هەروەها رۆڵە کۆمەلآیەتییەکەی سەرکردایەتی لە کاری هەرەوەزی و، پاراستن و دروستبوونی گرووپەکان و یەك ریزی و، تێرکردنی پێداویستییەکانی ماددی و کۆمەلآیەتی و سایکۆلۆژی و یارمەتیدان لەسەر دیاریکردنی ئامانجەکانیان و چالاکییەکان، لە دیاریکردنی ئایدۆلۆجی و داب و نەریت و فەرهەنگی نێو تاکەکانی گرووپدا دەردەکەوێت. هەروەها رێکخستنیش پرۆسەی ئاوێتەبوونە، لە نێوان ئەندامانی گرووپدا و کەمکردنەوەی دڵەراوکێیە، بۆ بەدەستهێنانی

ئامانجــەكانیان[٣١]. گرنگــی ســەركردایەتی وەك نوانــدنی نــاوەڕۆكی پرۆســەی بەڕێوەبردنی لێدانی دڵە لە كلیلی كارگێڕیدا، لە هەموو لایەكی پرۆسەكەدایە، كـە باشــترین و زۆرتــرین جوولــەر و بكەریــەتی. ســەركردایەتی ڕۆڵێكــی گــرنگ لــە دیــاریكردنی ئامــانجی گــرووپ و پلانــی چــالاكییان دەگێڕێــت، زیــاتر پێویــستی سەركردایەتی دەردەكەوێت لە كاتێكدا گرووپێك بـە تەنگژەیـەك لـە تەنگژەكانـدا تێدەپــەڕێت، یــان تووشــی ترســناكترین ترســناكی دەبێــت، گرووپەكـە ناتوانێـت بــەرەنگاری بێتــەوە، هــەر بۆیــەش لێــرەدا پێویــستی دەركــەوتنی ســەركردە دەردەكەوێت[٣٢].

**ئاستەكانی سەركردایەتی**

١- ســەركردایەتی پیــشەیی : ســەركردایەتییە پیــشەییەكان، لــە بــواری كــاركردن و، بیردۆزی، یان چالاكی خۆشگوزەرانی دەگرێتــەوە و دابەشــی ئــەم بەشــانەی خــوارەوەش دەكرێت :

أ- سەركردایەتی پلاندانان و دانانی سیاسەتی گشتی لە گشت بوارەكاندا .

ب- سەركردایەتی جێبەجێكەر و جێبەجێكردنی پلانەكان .

ج- ســەركردایەتی ڕووكــارو ئاراســتەكەر ئــەركی لــە ئەســتۆ گرتنــی كارەكــانی بەدواداچوون و سەرپەرشتیكردنی كارەكانە لە دەزگاكان و دەستە گشتییەكاندا .

٢- سەركردایەتی خۆبــەخش : گــشت ئــەو ســەركردایەتییانە دەگرێتــەوە كـە لـە دامودەزگاكاندا بێ بەرامبەر هێز و توانای خۆیان دەخەنە كاركردن .

---

[٣١] د. عمر احمد همشري: التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص٢٥٨ص ٢٥٩

[٣٢] د. ابراهيم ياسين الخطيب و آخرون: التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٢.

٣- سەرکردایەتی سروشتی: بریتین لەو کەسانەی کە گشت بنەماکانی پەیڕەوکردنی سەرکردایەتیکردنیان، تیادا بەدی دەکرێت، هەر بۆیەش هەوڵ دەدرێت، کە ئەمانە بخرێنە ناو ڕیزەکانی کارکردنی سەرکردایەتیکردن. چونکە خۆیان سروشتییەتی سەرکردایەتیکردنیان تێدایە[٣٣].

## دووەم: ڕێگاکانی دیاریکردن و هەڵبژاردنی سەرکردە و فەرماندە کارگێڕییەکان :

ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان بۆ دیاریکردنی بەرپرس و سەرکردە و کارگێڕی بەڕێوەبردن بۆ پۆستە گرنگەکان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بە پێی بۆچوونی (پرۆفیسۆر گلاّدن) بۆ هەڵبژاردنی شێوەی سەرکردەکان[٣٤]. شێوەی دیاریکردنی سەرکردەکانی بەڕێوەبردن، چەندین سیستەم و شێوەی جۆراو جۆر هەن لە قۆناغە مێژووییە جۆربەجۆرەکانی جیهاندا[٣٥]، لەوانەش:

**١- سیستەمی ئازادی تەواو لە هەڵبژاردن و دیاریکردن:** سەربەستی تەواو لە هەڵبژاردن و پشت بە هیچ بنەمایەکی دیاریکراو نەبەستن لە دیاریکردنی فەرماندە کارگێڕییەکاندا، بەڵکو بۆ سەرۆك و فەرمانڕەوایەکان سەربەستی تەواو بۆ هەڵبژاردنی جێگرو باوەڕ پێکراوان و ئەڵقە لە گوێکانیان جێ دەهێڵن بە بێ هیچ مەرج و پێچ و پەنایەك، تەنها باوەڕی تەواو بەو کەسانەی کە هەڵیان دەبژێرن هەبێت بۆ وەرگرتنی ئەرك و پۆستە فەرماندەییەکان. ئەم شێوەیەش بۆ دیاریکردن و

---

[٣٣] ا. د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية في المؤسسات التعليمية، دار الفكر للطباعة والنشر، عمان، الاردن، الطبعة الاولى، ٢٠٠١، ص ٥٥.

[٣٤] د. سليمان محمد الطماوي: الادارة العامة، المصدر السابق، ص١٦٥.

[٣٥] بڕوانە: د. عبدالحميد محمود النعمي: مبادى الادارة العامة، شركة ELGA فالينا مالتا ١٩٩٧، ص١٥١-١٥٢.

وەرگرتنی پۆستە رامیارییەکانی دەوڵەتە. وەك وەزیرەکان و پارێزگارەکـان و سـەرکردە و فەرماندە سەربازییەکان و سەرۆکایەتییەکانی دەستەی گشتی بالا[٣٦]. دەسـەلاتداریەتی رامیاری لە هـەر دەوڵـەتێك جـا چ (حـاکم، پاشـا، ئـەمیر ...هتـد) لـە هەڵبـژاردنی یاریدەدەران و بەرپرسە کارگێڕییەکان و جێبەجێکەری لە رامیـاری گـشتیدا سەربەسـتی تەواوی هەیە، لـە هەنـدێك ولاتانـدا دەسـەلاتدار ئـازادی تـەواوی هەیـە لـە دانـان و دیاریکردنی بەرپرسی جێبەجێکەر و یاریدەدەرەکانیدا. وە زیاتریش لە دۆست و لایەنگرو ئەڵقە لە گوێیەکان و ناسراوەکان و هاورێیانیاندا دەبن[٣٧] ئەم رێگەیەش لە هەڵبژاردن و دیاریکردنی سەرکردەکاندا پشت بە پەیوەندییەکانی کەسایەتییەکان دەبەستێت، ئەمەش هەرەشەیە لە دەزگاکانی بەرێوەبردن و تووشی شێواندن و گەندەڵییان دەکـات. ئەمـەش دەبێتە هۆی بلاوبوونەوەی لایەن لایەنی و ئەڵقە لە گوێیی و بەرتیل وەرگرتن. سـەرەرای دوورکەوتنەوە لە گیانی دیموکراتییەت و پێشێلکردنی پرەنسیپەکانی یەکـسانی لـە نێـو هاونیشتمانییەکاندا، لە پێـدان و وەرگرتنـی ئـەرك و پیـشە گـشتییەکاندا. ئەمانـەش هەموویان لە رژێم و سیستەمە گشتییەکاندا، لەو ولاتانەی کـە رژێمەکـە و سیـستەم و لایەنە سیاسییەکەی دەسەلاتی تەواوی هەیە[٣٨]. ئەم جۆرە ئـازادی و سەربەسـتییە لـە هەڵبژاردن و فەرمانرەواییکردندا لایەنی باش و خراپیشی هەیە. لەوانەش[٣٩].

**١- لایەنە باشەکان** : ئەو جۆرە ئازادییـە یارمـەتی فەرمانرەوایـەکان دەدات، لـە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە باوەری تەواویان پێیان هەیەو یارمـەتیـدەر دەبـن لـە

---

[٣٦] د. احمـد حـافظ نجـم، مبـادئ علـم الادارة العامـة، ، ملتـزم الطبـع والنـشر دار الفكـر العربي، ١٩٧٢، ص ٢٤٦.

[٣٧] د. عبدالحميد محمود النعمى، مبادي الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٥١.

[٣٨] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، مصدر السابق، ص٣٢٧.

[٣٩] د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ١٩٨٣، ص ٢٤٦

ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکانیاندا. لە پێنـاوی بەدەسـتهێنانی بەرژەوەنـدی گـشتیدا پێکەوە کار دەکەن. لە سـەپاندنی یـەکێك بەسـەر یـەکێکی تـر باشـترە، چـونکە سەپاندن دژایەتی و دووبەرەکی و ململانێی تێدایە، بۆ بەدەست نەهێنانی گونجـانی پێویست ئەو سەپاندنە گرووپێك دروست دەکات، کە لەگەڵ بەرژەوەندی کارکردنـدا ناگونجێت.

**٢-لایەنە خراپەکان:** لـە کاتێکـدا فەرمانڕەوایـەکان و دەسـەلأتدارەکان کەسـانی خـاوەن خەسـڵەتی سـەرکردایەتی و توانـای کەسـایەتی پێویـست لـە ئـەرك و بەرپرسیاریەتی ترسناکدا هەڵنابژێرن بەڵکو تەنها گرنگیدان و پەنجـە خـستنە سـەر ئەو کەسانەی کە باوەڕی تەواویان پێیان هەیـە، ئەمـەش زەرەرو زیـانێکی گـەورە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بە دەستەی بەڕێوەبردن و دەزگاکەی دەبەخـشێت. بەسـەر دانواندن بۆ ژمارەیەك لـە سـەرکردەکان دەبێتـە هـۆی دوور خـستنەوەو بـەلانانی هەندێك ڕێگا لـە شـێوەکانی سـەرکردایەتیکردنی بەڕێوەبردنـدا کـە هـیچ خـەم و خەفەت و هیوایەکیان نییە، تەنها ڕازیکردنی سەرۆکەکانیان و ئەو کەسـانەی لـەم پلەو پایە و شوێنانەی کارگێڕی و بەڕێوەبردندا دایاننـاون . ئەگەر بێت و تەماشـای وڵاتی خۆمان بکەین، لەسەر ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و ئابووری و کۆمەلأیـەتی و ڕۆشنبیرییەی کە بەسەر ناوچەکەدا هاتووە، دەبیـنین چـەندین، گۆڕانکـاری ئـەنجام دراوەو بـەرپرس و سـەرکردە جۆربـەجۆرەکان گۆڕانکارییـان بەسـەر دامودەزگـا جۆربەجۆرەکانـدا هێنـاوە، بـێ گوێدانـە ڕێنماییـەکان و توانـاو لێهـاتوویی ئـەو کەسانەی کە دایانمەزراندوون، پلەو پۆسـت و سـەرکردایەتی و بەڕێوەبەرایـەتی بـە کەسانی جۆربەجۆری بێ ئەزموون و ناشارەزا سپێردراوە، ئەمانەش بۆ بەرژەوەنـدی سەرکردەکانی سەرووتر کاریان کردووە، یان بۆ بەرژەوەنـدی لایەنـە سیاسـییە بـالأ دەستەکان کاری ناڕەواو نایاساییان ئەنجام داوە، ئەمانەش بوونەتە هۆی وێرانکاری

بەڕێوەبردن و خراپکاری لە دامودەزگاکاندا، تەنانەت تا گەیشتووەتە لادان و دەرکردنی چەندین کەسانی دڵسۆزو نیشتمانپەروەرو خاوەن ئەزموون و پسپۆڕ، شوێنەکانیش بە کەسانی ناشایستەو بێ هێزو بێ توانای خزمەتگوزاری ڕاستەقینە پڕ کردۆتەوە. بەتایبەتیش شەڕی ناوەخۆو ململانێی سیاسی لایەنە جۆربەجۆرەکانیش ڕۆڵێکی خراپیان لەم بارەیەوە بینیوە. ئەمەش زیاتر لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا دەردەکەوێت، هەروەها لە هەندێك وڵاتی پێشکەوتووش کە وڵاتەکەیان لە ژێر سیستەم و فەرمانڕەوایی پارتە سیاسییەکاندانە، چونکە پارتی سەرکەوتوو هەڵدەستێت بە دیاریکردنی لە لایەنگران و ئەندامانی پارتەکەی بۆ دانان و پڕکردنەوەی پۆستە وەزاری و سیاسییەکانی دەوڵەت.

**٢- پایەی کۆمەڵایەتی (المركز الاجتماعي) (Status Social)**: لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی فیرعەونەکانی میسریدا، پەیڕەوی پایەی کۆمەڵایەتی کراوە، بۆ دیاریکردنی ئەوانەی ئەرك و فرمانی سەرکردایەتی و فەرمانی دەیی وەردەگرن، بە تایبەتیش لەسەر بنچینەی چینە کۆمەڵایەتییە بەرزەکان[٤٠]. ئەم ڕێگەیە لەسەر بنچینەی هەڵبژاردنی کەسایەتییەکان، بۆ وەرگرتنی پلەو پایەکان، لە دامودەزگاکاندا دەبێت. پشت بەو کەسانەی کە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی بەرز، بنەماڵەو خێزانە ناسراوەکان یان خاوەنی سامانی بەرز بێت دەبەستن، بۆ دامەزراندنیان و پێدانی پلەو پایەی بەرز لە دەزگاکانی دەوڵەت و کۆمپانیا و دەزگا گەورەکاندا. سەرەڕای ئەوانەی سەروەت و سامانێکی زۆریان لەبەر دەستدایە، بۆ ئەوەی لە پێناوی بەرژەوەندییەکانیاندا بەکاریان بهێنن. ئەم ڕێگەیەش لە سەردەمی چاخی دەرەبەگایەتیدا لە سەدەکانی ناوەڕاست بلاۆ بۆتەوە، کە دەسەڵات بۆ خاوەنی سەروەت و سامان و دەرەبەگەکان بووە، ئێستاش زۆر بە

[٤٠] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق، ص٣٢٨

دڵسۆزانە لە هەندێك شوێن و لەناو لایەنە سیاسییەکاندا پەیڕەو دەکرێت[٤١]. تاکو ئێستاش لە هەندێك ولاّتـان و شـوێنانی جیاجیـای ئـەم جیهانـە بەردەوامـە، بـە تایبەتیش لەو شوێنانەی کە ئاستی خوێندەواری و ڕۆشنبیری تێیدا لاوازە و ئاستی هوشیاری و هەستی بەرپرسیاریەتی کارگێڕی نەگەیشتۆتە پلـەی ڕێگـە پێـدان بـۆ توێژینــەوەو گەیــشتن بــە ڕێگــەی باشــترو گونجــاو بــۆ وەرگرتنــی ئەرکــەکانی سەرکردایەتیکردن. وە ئێستاش ئەم ڕێگەیە پەیڕەو دەکرێت لە پێدانی پلەی کادری و پشت بەسـتن بـە پایـەی کۆمەلاّیـەتی لـە ئەرکـەکانی کـاری دبلۆماسـیدا[٤٢]. (پرۆفیسۆر گـلادن) ئامـاژە بـەوە دەکـات، لـە ڕەفتـاری هەڵبـژاردنی سـەرکردەو فەرماندەکان لەسەر بنچینەی پایەی کۆمەلاّیـەتی تاکـەکان لـە هەنـدێك خێزانـدا دەگەڕێنەوە بۆ چینێکی دیـاریکراو، لـە هەنـدێك بنەماڵـەدا بووەتـە نـەریت لـە داهێنــانی بــەڕێوەبردنی کــارگێڕی دیــاریکراو. ئــەم بنەمالاّنــەش بــە شــێوەیەکی هونەرییانە ڕاهاتوون لە سازکردنی هەندێك لە تاکەکانی خێزانـەکانیان بـۆ ئـەوەی پلەو پایەی بەڕێوەبردن لە کۆمەڵگاکەیاندا وەربگرن[٤٣]. ئەم ڕێگەیەش سـەرەتایی و دواکەوتوویییە بۆ هەڵبژاردنی لەم جۆرەدا لەسەر بنـچینەی زانـستی ڕاسـتەقینە هەڵناستێت، وە لەسەر بناغەو بنەمای سەرکردەو فەرماندەی کارگێڕی سەرکەوتوو بەرامبــەر بــە ئەرکــە بەرپرســیاریەتییەکەدا نابێــت. بۆیــەش هــەموو کــات لــە دیاریکردنی سەرکردەی گونجاو سەرکەوتوو نابێـت و دەبێتـە هـۆی زەرەرمەنـدی و زیان پێدانیان بۆ ڕێکخراوە کارگێڕییەکان کە کاریان تێیدا دەکەن. بـلاّو بوونـەوەی دیموکراتی و پەیڕەوکردنی لە زۆربەی هەرە زۆری ولاّتانی جیهـانی شارسـتانیەتیدا،

---

[٤١] بڕوانە: د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٦٦.

[٤٢] د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، مصدر السابق، ١٩٧٩، ص ٢٤٢

[٤٣] د. سليمان محمد الطماوي، الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٦٧.

بەم شێوە دیاریکردنەی سەرکردەو سەردارو سەرۆکەکان بە شێوەیەکی فراوان ڕێگـە نادرێـت[٤٤]. هەنـدێ جـاریش پلـەی بەرپرسـیاریەتی ئەبەسـترێتەوە بـە پایـەی کۆمەلآیەتی بە تایبەتیش، لە بواری هـۆزو عەشـیرەت و پلـەو پایـەی سیاسـی و پارتایەتیشدا. هەروەك ئەوەی لە هەرێمی کوردستاندا بەرچاو دەکەوێت.

**٣- هەڵبژاردن (Election ):** هەڵبژاردنی هەر تاکێك بۆ هەر پلەو پایەیەك کە پەیڕەوی ڕێبازی هەڵبژاردن لە هەر کۆمەڵگایـەك بکرێـت، تاکێـك لـەم گـرووپ و کۆمەڵگانە کە زۆرینەی دەنگەکان بە دەست بهێنێت سەرکەوتوو دەبێـت، لـە دێـر زەمانەوە ئـەم ڕێبـازە پـەیڕەو کـراوەو تـاکو ئەمڕۆکـەش پـەیڕەو دەکرێـت. (لـە چاخەکانی پێش زایینیدا بە تایبەتیش لە چـەرخی پێنجـەمی پـێش زایینیـدا لـە ئەسینای دیمۆکراتییەتدا بۆ هەڵبژاردنی سەرکردەکان بۆ بـەڕێوەبردنی ولآت پـەیڕەو کراوە)[٤٥]. لـەم ڕێبـازەدا تاکـەکانی کۆمـەڵگا سـەرکردەکانیان بـە شـێوەیەکی ئازادانـەی ڕاسـتەوخۆ هەڵدەبـژێرن[٤٦]. مەبەسـتیش ئـەو شـێوە گونجاوەیـە کـە دەیانەوێت ئامانجەکانیان بەدەست بهێنرێت[٤٧]، جا بۆیـە پێویـستە پاڵێوراوەکـان لەسەر بنچینەی توانای لێهاتوویی بن و خاوەنی شارەزایی تەواو بن، بـۆ وەرگرتنـی هەر پلەو پایەیەکی کـارگێڕی و بـەڕێوەبردن هـەروەها لـە لایـەن ڕێکخراوەکـان و گرووپەکانیانەوە ڕەزامەندی زۆرینەی بەدەست هێنابێت[٤٨]. هەر بۆیەش دەتـوانین بڵێین هەڵبژاردن بۆ سەرکردەو فەرماندەو بەڕێوەبـەرە کارگێڕییـەکان ناشـێت، وەك

---

[٤٤] د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص٢٤٣ .

[٤٥] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٣٣٠..

[٤٦] د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، المصدرالسابق، ص٢٣٤

[٤٧] د. طـارق عبدالحميـد البـدري، الاسـاليب القياديـة والاداريـة في المؤسـسات التعليميـة، ٢٠٠١، ص ٦٧.

[٤٨] د. عبدالحميد محمود النعمى، مبادئ الادارة العامة، المصدر السابق ص ١٥٢.

هەڵبژاردن بۆ سەرکردە سیاسییەکان ئەنجام بدرێت، تەنها ئەگەر پاڵێوراوەکە خاوەنی تواناو لێهاتوویی و شارەزایی تەواوی لە بوارەکەدا هەبێت، وەك هەڵبژاردنی ڕاگرێك، سەرۆکی زانکۆیەك، سەرۆکی شارەوانی، سەرکردەیەکی سەربازی لە بوارەکانی سەربازیدا[٤٩]. زۆر جاریش لە ئەنجامی هەڵبژاردنی کەسێك بە شێوەیەکی دیموکراتیيانە لە کارەکانیدا سەرکەوتوو نابێت، چونکە باوەڕی جەماوەرو خۆشەویستییان بۆ کەسێك مەرجی تواناو لێهاتوویی ئەو کەسە نییە بۆ بەرپرسیاریەتی و بەڕێوەبردن بە تایبەتیش لەو وڵاتانەی کە تەنها پارتێك فەرمانڕەوایی تێیدا بکات و تەنها یەك پاڵێوراویش هەبێت، ڕێژەی دەنگدەرانیشی بە ١٠٠٪ بە دەست بهێنێت. هەڵبژاردنیش بە شێوەیەکی خولانەوە دەست پێدەکات و ئەنجام دەدرێت، لە وەرگرتنی پۆستەکاندا ( Retation of offices) وە یارمەتی تەواوکردنی بنەماکانی سەرکردایەتی و بەڕێوەبردنی کارگێڕی نادات. ئەمەش لە هەموو وڵاتانی جیهاندا پەیڕەو ناکرێت، تەنها بە شێوەیەکی گشتی و تایبەتیش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبێت، کە بۆ پڕکردنەوەی پۆستەکانی کارگێڕی و بەڕێوەبردن پەیڕەو دەکرێت[٥٠]. بەڵام ئێستاکە لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی جیهان پەیڕەوی ڕێبازی هەڵبژاردن دەکرێت، بە تایبەتی لە وڵاتە دیموکرات و فرە لایەنەکانی پارتایەتی و پەرلەمانیدا .

**٤- چاوپێکەوتن بۆ هەڵسەنگاندنی کەسایەتی کارگێڕی:** چاوپێکەوتن ڕێگایەکی باوەو بڵاوە بۆ تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی هەر کەسێك لەسەر ئاستی بەرزو نزمی سەرکردە و سەرکردە کارگێڕییەکاندا بێت، زۆرترین جار چاوپێکەوتن و تاقیکردنەوەکان گشتی و سەرزارەکی دەبن لە هەڵسەنگاندنی کەسایەتی

[٤٩] د. طارق المجذوب مصدر السابق، ص ٤٩٧.

[٥٠] د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ علم الادارة العامة، المصدرالسابق، ص ١٦٨.

پاڵێوراوەکـەو هەڵـسوکەوت و لـەش سـاغی و ڕۆشـنبیری و ئاسـتی زانیارییـە گشتییەکان و ئاستی زیرەکی و شارەزایی چالاکییەکان و ڕابردوویی کاروچـالاکی و کارگێڕییـەکان، بەتایبـەتیش ئـەو چـاوپێکەوتنە لەسـەر ئاسـتی کۆمپانیاکـان و دەزگاکانی ئابووری دەبێت، ئەوانەی پەیوەندییان بـە پەیوەندییـە دەرەکییەکانـەوە هـەبێت دەگرێتـەوە[51]. چـاوپێکەوتن ڕێگەیەکـە لـە ڕێگاکـانی تاقیکردنـەوەی سەرکردایەتیکردنەکاندا، ئەمـەش لەسـەر چـالاکی و پـسپۆڕییەتی ئـەو کەسـەی هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی چـاوپێکەوتن و تاقیکردنـەوەی پاڵێوراوەکـە تێبینـی و دەرفەت وەرگرتن لێی، ئەمەش زۆرجار گرانەو بە ئاسانی ئەنجامەکەی دەرناکەوێت، بەلاّم لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی چاوپێکەوتنەکان زیاتر ڕوون و ئاشـکرا دەبـن و ئەنجامی پێویست دەردەکـەون[52]. پێویـستە بـۆ چـاوپێکەوتن لـە تاقیکردنـەوە پیـشەییەکاندا، پاڵێوراوەکـە پـسپۆڕییەتی هونـەری و سـیفاتی پێویـستی سەرکردایەتیکردنی کارگێڕیەتی تێیـدا بێـت، ئـەوەش لـە ڕێگـای تاقیکردنـەوەی هونەری بۆ پایە کارگێڕییەکان دەبێت. ئەڵمانیا ئەم ڕێگەیـە پـەیڕەو دەکـات، بـە تایبەتیش بۆ پایە کارگێڕییە سەرەکییەکانی یاسایی و ئابووری[53].

**٥-سیستەمی لێهاتوویی:** لەسەر بنچینەی لێهاتوویی سەرکردە هەڵدەبژێردرێت، بە تایبەتیش لەسەر سیستەمی لێهاتوویی، کە بـە باشـترین ڕێگـا بـۆ دیـاریکردن و هەڵبـژاردنی چـینی سـەرکردایەتیکردنی کـارگێڕی دادەنرێـت. ئـەم سیـستەمەش دیاریکەر و کاکڵـەی دابینکردنـی ڕەگـەزە باشـەکانە بـۆ گرتنـە دەسـتی ئەرکـە قورسەکانی کارگێڕی، سەرەڕای لێهاتوویی و یەکسانیکردن لـە نێـوان داواکـەرانی

---

[51] نفس المصدر، ص ٢٤٤.

[52] ا. د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية في المؤسسات التعليمية، المصدر السابق، ص٦٦.

[53] د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٦٩.

گرتنە ئەستۆی ئەرك و فرمانەكانی سـەركردایەتیكردن لـە دەوڵەتـدا. سیـستەمی لێهاتوویی وەك شێوازێك بۆ هەڵبژاردنی سەركردەو فەرماندە كارگێڕییـەكان بـەكار دێت چەمكەكەی دەگۆڕێت لە شوێنێكەوە بـۆ شـوێنێكی تـر(٥٤). بـۆ وەرگرتنـی پایەی كارگێڕی و سەركردایەتیكردن سیستەمی لێهـاتوویی بـە باشـترین ڕەگـەزی كارگێڕی دادەنرێت. ئەمەش لە دوو شێوەی سیستەمی سەرەكیدا دەبێت :

أ- سیستەمی فەرەنسی: ئەویش دوو شێوەو سیستەم و ڕێگا لە خۆ دەگرێت كە بریتین لە :

١- ڕێگەی بەرزكردنەوە: ڕێگەی بەرزكردنەوە لەسەر بنچینەی توانای ئەنجامدانی كارەكان دەبێـت، بەرزكردنـەوەش لـە ئەنجامـدانی تاقیكردنـەوە و لیژنـەكانی هەڵـسەنگاندن و ڕاپۆرتەكانەوە دەبێت، لـە ئـەنجامی تاقیكردنەوەكانـدا ڕەگـەزەكانی ئامـادەو گونجـاو بـۆ وەرگرتنی پیشەو ئەركە كارگێڕییە دیاریكراوەكان هەڵدەبـژێردرێت(٥٥). هـەر بۆیـەش لـە ئەنجامی بەرزكردنەوەدا، زۆر جار دەبینین فەرمانبەرێك لە پلەكەی خۆی بۆ پلەیەكی بەرزتر بەرز دەكرێتەوە بۆ وەرگرتن و پڕكردنەوەی پایەكی فەرمانبەری. بەڵام ئەگەری ئەوەی تێـدا نییە ئەو فەرمانبەرە یا سەركردەو فەرماندەیە بتوانێت لەو پۆستەیەدا سەركەوتن بە دەست بهێنێت، چونكە مەرج نییە شیاوترین و باشترین كەس بێت بۆ ئەو ئەركـە لێـرەدا زۆرجـار بەپێی ڕێنماییەكان یان ماوەی درێژی خزمەتكردن پلەكەی بەرز دەكرێتـەوە، یـان بـاوەڕی سەرۆكەكانی بۆ خۆی وەرگرتووەو بەرزیان كردۆتەوە. چونكە زۆری خزمەت و درێژی ماوەی خزمەتكردن، یان باوەڕی بەرپرسەكان، مەرج نییـە بـۆ هـەر كەسـێك توانـای وەرگرتنـی خەسڵەتی سەركردایەتی و سەركردایەتیكردنی هەبێت و بەدەست هێنابێت بـۆ وەرگـرتن و جێگرتنەوەی پلەو پایەو پۆستە كارگێڕییەكانی سەركردایەتیكردنی كارگێڕی(٥٦).

---

(٥٤) د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٢١٣.

(٥٥) د. عبدالحميد محمود النعمي، مبادئ الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٥٢.

(٥٦) بڕوانە: د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٢٤٥.

٢-ڕێگەی دامەزراندن : کەسێك یان گرووپێك پایەی سەرکردایەتیکردن وەردەگرێت لە دامەزراندنی سەرکردەو فەرمانەدەکان لە کارەکانیاندا، ئەو ڕێگەیەش لە دامودەزگاکانی جێبەجێکردنی دەوڵەتیدا پەیڕەو دەکرێت[٥٧]. دامەزراندن لە ڕێگەی پێشبڕکێ و تاقیکردنەوەکاندا ئەنجام دەدرێت، کە چەندین پاڵێوراو تێیدا لە ململانێدان بۆ وەرگرتنی کارو پیشەو چەند ئەرکێکی دیاریکراو. لێرەدا تاك تەوەری پرۆسەی کارگێڕییەکەیە، وە بنچینەکەی کاری کارگێڕییە. دەوڵەت بە بەرزکردنەوەو بەرزکردنەوەی سەرمووچەی ساڵانەی فەرمانبەرەکانی پابەند دەبێت وە لە لایەن میرییەوە پاش کۆتاییهاتنی ماوەی کارکردنی هەر تاکێك بە پێی ڕێنماییەکان خانەنشین دەکرێت و چاودێری دەکرێت[٥٨].

ب- سیستەمی ئەمریکی : ئەم سیستەمە لەسەر تیۆری ڕیزبەندی بابەتییانەی پیشەکان دەبێت، پیشە و کارمەندەکە تەوەری کاری کارگێڕییەکەیە، بنچینەو بناغەو بنەمای کارە لە حکومەتدا. پاڵێوراوەکان لە ئەنجامی پێشبڕکێی گشتیدا دەبێت بۆ دامەزراندن و بەرزکردنەوەیان، لەم ڕێگەیەش پاڵێوراوی پێویست هەڵدەبژێردرێت . لە بارەی بەرزکردنەوەدا پاش بەشداریکردنی فەرمانبەرەکە لە پێشبڕکێیەکەو دەرچوونی، سەرلەنوێ گرێبەستەکە لەگەڵ ڕێکخراوەکەدا نوێ دەکرێتەوە. بۆ وەرگرتنی ئەم (پایە)یەو بە جۆرێکی جیاوازو جیا لە مێژووی فەرمانبەرایەتی پێشتردا[٥٩].

---

[٥٧] ا. د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية في المؤسسات التعليمية، المصدر السابق، ص٦٦.

[٥٨] د. عبدالحميد محمود النعمي، مبادي الادارة العامة، مصدر السابق، ١٩٩٧، ص ١٥٢.

[٥٩] نفس المصدر ص ١٥٣.

## سێیەم: کار و ئەرکەکانی سەرکردایەتی (وظائف القيادة)

کاری سەرکردە جیاوازەو ئەگۆڕێ لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر، بە پێی جۆری سەرکردە، بۆ نموونە سەرکردەی داسەپاو کارەکانی لە ناو کۆمەڵگادا جیاوازە لە جۆری دیموکراسی. هەروەها هەندێ لە سەرکردەکان ڕەفتاریان بە شێوەیەك ئەنجام دەدەن کە بگونجێ لەگەڵ شێوەی دەسەڵاتیان و لایەنگرانیان، بەجۆرێ لە خۆ کۆ دەکەنەوە بۆ ئەوەی بواری گونجاندنیان بۆ بڕەخسێنن و ئەندامانی کۆمەڵ گوێڕایەڵیان بن[٦٠]. بە شێوەیەکی گشتی سەرکردەکان ڕۆڵی جۆراوجۆر جێبەجێ دەکەن، بەکاری زۆر هەڵدەستن[٦١]. بە پێی بۆچوونی (پرۆفیسۆر نیومان) کارو ئەرکی سەرکردە بریتییە لە(پلاندانان، ڕێکخستن، کۆکردنەوەی داهات، ئاراستەکردنی زانیاری و ڕێنمایی هەروەها چاودێریکردن)[٦٢]. ئەرکی بنچینەیی سەرکردە، بریتییە لە کارکردن، لە پێناوی یەکێتی و یەکگرتن و یەك ڕیزی لەناو کۆمەڵدا[٦٣]. کەچی فقهی ئەمریکی Luther Gulnk لە پێکهاتەی وشەی Pasdcorb کە لە پیتە سەرەتاکانی هەر وشەیەك وەرگیراوەو بە ناونیشانی ئەرکەکانی سەرکردە دانراوە لە پسپۆڕیەتی سەرکردەی کارگێڕی[٦٤]. لە خوارەوەدا بە پێی پیتەکانی ریزبەندی وشەی Pasdcorb و چەند ئەرکێکی تر بە کورتی

---

[٦٠] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون: التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٢.

[٦١] د. عمر احمد همشري: التنشئة الاجتماعية للطفل، مصدر السابق ص ٢٥٩ .

[٦٢] د. محمد سعيد عبدالفتاح: الادارة العامة، المكتب المصري الحديث، الطبعة الثانية، ١٩٧٣، ص١٨٤.

[٦٣] عبدالغفور يونس: دراسات في الادارة العامة، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت ص ب ٧٤٩، لسنة ١٩٧٢، ص ١٧٩.

[٦٤] الدكتور سليمان محمد الطماوي: مباديء علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص١٧٤.

ئاماژەی پێ دەکەین، هیوادارین لە کارو ئەرکەکانی دامودەزگاکانی حکومەتی کوردستاندا سوودی لێ وەربگیرێت، ئەمانەی خوارەوەن:

**١- پلاندانان: Planning** بە واتای دیاریکردنی سیاسەتی گشتی و پێشهاتەکانی دوارۆژی پرۆژەکەیە، لەسەر بنچینەی بنەماکانی مادی و مەعنەوی[٦٥]. وەك پلانانداانان و بڕیار لەسەر ئەو هۆکارانەی کە دەبنە جێبەجێکردنی ئامانجی گرووپ یان ئەندامانی کۆمەڵ، ئەو پلانەش چ شێوەی ماوەی درێژخایەن، یان کورت بێت[٦٦]. زۆرترین جار سەرکردە، خۆی دانەرو پاسەوانی بنچینەی پلانەکەیە، ئاگادار و شارەزایی ناوەرۆکەکەیەتی[٦٧]، خۆی چوارچێوەی گشتی پلانەکە دەزانێت، لە کاتێکدا ئەوانی تر نایزانن، تەنها هەندێك لایەنی پلانەکە نەبێت[٦٨]. **بۆ نموونە سەرکردەی سەربازی ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە ئەنجامدانی پلان و دابەشکردنی ئەرکی جەنگی بەسەر جەنگاوەرانەوە، لە هەمان کاتدا پلانی بەرگریکردن و بە هێزکردنی سەنگەرەکان و چاودێریکردنی خاکی دوژمن و ژمارەو هێزی ئەکات[٦٩].**

**٢- ڕێکخستن Organizing:** کۆکردنەوەی گشت هۆکارە ماددی و مرۆییە هاوکارە جیاوازەکانە، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی هاوبەش[٧٠]. ئەرکێکی گران

---

[٦٥] نفس المصدر، ص ١٤٧ .

[٦٦] د. ابراهيم احمد ياسين وآخرون: التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٤ .

[٦٧] د. عمر احمد همشري: التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق ص ٢٦٠ .

[٦٨] صالح محمد علي ابو جادو: سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص ١٦٦.

[٦٩] د. احسان محمد الحسن: علم الاجتماع العسكري، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت الطبعة الاولى ١٩٩٠، ص ١٩٠.

[٧٠] د. سليمان محمد الطماوي: مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق ص ١٧٤.

دەکەوێتــە ئەســتۆی ســەرکردەی کــارگێڕی، لــە هەســتانی بــە ڕێکخــستنە کارگێڕییەکەی، چ لە رووی دەستەکەی، یان مرۆیی بێت، بەپێی بنچینەی زانستی، وە پێویستە بەپێی توانا دوور بکەوێتەوە، لە شێوەی سەپاندنی دەسـەلآت لـە نـاو دەستی دەسەلآتە بەرزەکاندا، بەڵکو بە پێی پێویست بگەڕێتەوە، بـۆ پـسپۆڕەکانی سەرۆکە کارگێڕییەکانی ناوچەکانی تری، ئەگەر ببێتە ئاسانکاری کارەکانی خـۆی، لە هەمان کاتـدا پێویـستە ڕەچـاوی توانـای کـارگێڕان و ئامادەکارییـان بـۆ ئـەو ئەرکانەی پێیـان سـپێردراوە بکرێـت[٧١]. بنـەمای ڕێکخـستنی هـەر دەزگایـەك پەیوەستە بە قۆناغەکانی دەست بەکاربوون و قۆناغی دروستکردنی[٧٢]. زۆر جـار سەرکردە پێکهاتەی تەواوی گرووپ دادەنێت، ڕۆڵ و بەرپرسیاریەتی دیاری دەکات، پەیوەندییەکانی ناوەخۆ ڕێـك دەخـات، لـە زۆر کۆمەڵـەو گرووپـەکانی فەرمیـدا، پەیوەندی لە نێوان ئەندامانی نـاوەخۆو ئەنـدامان و سـەرکردە روون نییـە، وە لـە هەندێك گرووپیشدا، سەرکردە دوورە لە هـەموو ئەنـدامانی یـان بـە دەسـتەیەکی تایبەتی دەورە دراوە، وە لە هەندێك گرووپیـشدا جیـاوازی سـەرکردەو ئەنـدامانی دیار نییە[٧٣]. ئەرك و کاری ڕێکخستن نواندنی جۆرێکی پەیوەندی هەماهەنگییـە لە نێوان یەکەو بەشەکانیدا، دروستکردنی جۆرێکی بەستنەوەیە لە نێوان کەلوپەل و کەسەکاندا، کە کارو ئەرکـەکان دەگرێتـە خـۆ، لەسـەر شـێوەی ئـەم پەیوەنـدی و بەستنەوە کردارییانەدا، شێوەی سیستەم و ڕێنمایی دەگرێتە خۆی[٧٤].

**٣- سەرکردەو کاروباری کارمەندان STAFFING** : هەرچییەکی پەیوەنداره بەم ناونیشانە لـە دامەزرانـدنی فەرمانبـەران و کرێکـاران و جـەنگاوەران و مەشـقکردنیان و

---

[٧١] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، دار الجامعة للطباعة والنشر، ١٩٨٣ ص ٣٢٣ .

[٧٢] د. عبدالحميد محمود النعمي، مبادئ الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٥١ .

[٧٣] صالح محمد علي ابو جادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق،ص ١٦٥ .

[٧٤] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٦٩.

سەرنجراکێشان و بەرزکردنەوەیان...هتد[٧٥]. لە گـرنگترین ئـیش و کارەکـانی سـەرکردەو فەرماندەکان، ئامادەباشی جەنگییە، لە هێزی چەکداریدا، ئـەرك و کـاری ئامادەباشـیش کۆکردنەوەو هێنانە ریزی جەنگاوەرانە بۆ هێزی سوپای چەکدار[٧٦]. ئـەرکی سـەرکردە لـە رووی رێکخستنەوە ئەم بنەمایانەی خوارەوە دەگرێتەوە :

أ- ئەرکی جەنگاوەری : نزیکبوونەوەیە لە ترسناکترین بنکـەکانی دوژمـن و، ئەنجامـدانی شەڕو پێکدادان[٧٧]. هەروەها ئامادەباشی سـەربازی و مەشـق پێکردنـی سـەربازی، لـە بەکارهێنانی چەك و تفاقی جەنگیـدا، وە بـەکارهێنان و وەرگرتنـی پیـشەی سـەربازی و، ڕاهێنـانی هونـەری و هێرشـی و بـەرگریکردن و، جـەنگی شـەوانەو، نزیکبوونـەوە لـە مۆڵگاکانی دوژمن و، ئامادەیی بۆ هێرش و زاڵبـوون، کـە ئـەم ڕاهێنـان و مەشـقکردنە دەبێتە هۆی بەشداری جەنگ و بەدەستهێنانی سەرکەوتن بەسەر دوژمنـدا[٧٨]. ئەمانـەش لە نواندنی چالاکی فێرکردن و پـەروەردە لـە گـشت بوارەکـانی تـەکنۆلۆژی، رۆشـنبیری، سەربازیدا ئەمەش ئەرکی مەشق و فێرکردنە[٧٩].

ب- سەرکردە بەخشەری پاداشت و پێدەری سـزاکانە: سـەرکردە جیایـە، لـە هـەر تاکێکی تر، لە گرووپەکەیدا، بەو هێزو تواناو، دەسەلأتەی کـە پێـی دراوەو لەبـەر دەستیدایە، بە بەخشینی پاداشتی چاکەو پێدانی سزا . بۆ ئەوەی بتـوانێ قـەوارەو سیستەمێکی بە هێزو، کۆنترۆڵێکی رێکوپێك، لەگەڵ ئەنـدامبوونی گرووپەکەیـدا بەڕێوە بەرێت[٨٠]. وە ژمارەیەك لە تاکەکانیش یاریدەی دەدەن، لە جێبەجێکردنی

---

[٧٥] د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ علم الادارة، المصدر السابق ص ١٧٤ .

[٧٦] د. احسان محمد الحسن، علم الاجتماع العسكري، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، الطبعة الاولى ١٩٩٠، ص ١٥٩.

[٧٧] عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٦٨.

[٧٨] د. احسان محمد الحسن، علم الاجتماع العسكري، المصدر السابق، ص ١٥٩.

[٧٩] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٦٨.

[٨٠] د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٤.

دەسەلأتەکەیدا(٨١). چاکەو سزا راستەوخۆ پەیوەندیدارە، بەم کارەی کە تاکەکەس ئەنجامی دەدات(٨٢). بەلأم جۆری پاداشت و سزاو ئاستەکەی، وە چۆنیەتی جێبەجێکردنی، کە ئەمانە هەموویان لە ناو کۆمەڵ جێگیر بوونەو رەزامەندییان هەیە، لە پێدانی جۆری پاداشت یان سزاکە، بۆ رێکخستنی کارەکانیان. کە لە گرووپێکەوە بۆ گرووپێکی تر جیاوازە(٨٣). وە لە ئەنجامی شارەزایی سەرکردەو بوونی فاکتەری دادو یەکسانی کە بنەمای بابەتیانەن، بۆ دەرکردنی رێنمایی و رێگەیەکیشە لە هۆکارەکانی گەیشتن بە سەرکەوتن لە کارەکاندا(٨٤).

## رۆڵی سەرکردە لە پێدانی پاداشت و سزا:

**١- سەرکردەو بەخشینی پاداشت:** جا لە کاتی ئەنجامدانی پاداشت بۆ هەر کەسێکی گونجاو، کە مافی پاداشتکردنی هەیە و پێویستە پاداشت بکرێت، جا چ بەرز بکرێتەوە بۆ یەکێك لە گرنگترین پلە لە پلەکانی کارمەندی، فەرمانبەری یان سەربازی...هتد لە گرووپەکەیدا پاداشتێکی تایبەتی، لەناو کۆمەڵ و گرووپەکەیدا، بەدەست دەهێنێت(٨٥). جا چ پاداشتەکە ماددی یان مەعنەوی بێت(٨٦). پێشمەرگە زۆر جار لە کاتی ئەنجامدانی چالاکی سەرکەوتنەکانیاندا

---

(٨١) د. ابراهيم احمد ياسين وآخرون: التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٣.

(٨٢) د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، مصدر السابق ص ٥٤.

(٨٣) صالح محمد علي ابوجادو، سايكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص ١٦٥ .

(٨٤) د. طارق عبدالحميد، الاساليب القيادية فى المؤسسات، المصدر السابق ص ٦٢ .

(٨٥) د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٤.

(٨٦) فهمي سليم غزوي والآخرون. مدخل الى علم الاجتماع، دارالشروق للنشر والتوزيع، عمان ـ الاردن، الطبعة الثانية، ٢٠٠٤، ص١٩٩.

پاداشت کراون، چ پاداشتی ماددی یان مەعنەوی بوایە، هەروەها جاریش هەبووە، دەمانچەیەك، ڕادیۆیەك، کاتژمێرێك[٨٧]، بە دلێرو ئازاکان دەبەخشرا. زۆر جاریش تەنها ئافەرین ئەی کوڕە ئازاکان بووە[٨٨].

**٢-سەرکردەو بڕیاری سزادان :** لە کاتی سزادانی هەر تاکێك لە گرووپێکدا کە لایدابێت لە یاساو ڕێساکانی کۆمەڵگاکە، بەپێی یاساکان و داب و نەریت و ڕاهێنانی کۆمەڵایەتی، کە باوە لە ناو کۆمەڵگاکەیاندا سزا دەدرێت، لەم شوێنەی کە تێیدایە، یا بێ بەری دەکرێت و دوور دەخرێتەوە بۆ شوێنێکی تر لە ناو گرووپەکەیدا، وە لە کاتی ترسناکدا دوور دەخرێتەوە لە ئیش و کار، یان لە دەسەلاتی شوێنەکەی کەم دەکرێتەوە[٨٩]. وە بەپێی ڕاهێنانی کۆمەڵایەتی، لە دەزگاکانی کۆمەڵایەتیدا بە سزای گونجاو سزا دەدرێت، جا چ سزای ماددی یان مەعنەوی بێت[٩٠]. لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا سزادان لە ئارادا بووە، بە بێ جیاوازیکردن، جارێکیان بەرپرسێکی بەرزی پێشمەرگە ( پ) لەسەر هەڵەیەك سزا درا، کە بووە وانەو پەند بۆ گشت بەرپرس و پێشمەرگەکانی تر[٩١]. ئەمانەش لە نواندنی کاروچالاکی جێبەجێکردنی، هوشیارانە یان سەپاندنی یاساو ڕێساکان، لە قەوارەی سیستەم و فەرمانەکاندا، سەرەڕای ئەو کارانەی کە دەبنە هۆی پاراستنی هێمنی و ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵگا بە شێوەیەکی گشتی، وە دەزگاکانی سەربازیش بە تایبەتی[٩٢].

---

[٨٧] چاوپێکەوتن: مستەفا نێروەیی: دهۆك، لە ڕێکەوتی ٢٠٠٦/٨/٢١.

[٨٨] چاوپێکەوتن: حەمید حوسێن شوانی: هەولێر، شەقلاوە، ڕێکەوتی ٢٩ /٢٠٠٦/٧.

[٨٩] د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٤.

[٩٠] فهمي سليم غزوي وآخرون، مدخل الى علم الاجتماع، المصدر السابق، ص ١٩٩.

[٩١] چاوپێکەوتن: مستەفا نێروەیی: دهۆك، ڕێکەوتی ٢١ /٨ /٢٠٠٦.

[٩٢] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٦٨.

**٤- سەركردەو ڕێنماییكردن Directing** : ڕێنماییكردن چالاكییەكی بەردەوامی سەرۆكە، كە پەیوەندارە بە دەركردنی فرمانەكانی پێویست، بۆ جێبەجێكردنی ئەركە كارگێڕییەكانی، كە بە سەرۆكی كارگێڕی سپێردراون. وە بە دواداچوونی ئەم فرمانانە، بۆ دڵنیابوون لە جێبەجێكردنیان، بە شێوەیەكی داواكراو[٩٣]. یەكێك لە ئەركە مەزنەكانی سەركردەكان، هەستانیان بە دانانی ئامانجەكانی گرووپ و مەبەستەكەی و رامیارییەكەیەتی بە شێوەیەكی گشتی[٩٤]. هەروەك بارزانی نەمر دەفەرموویێت: كوردستان یەك پارچەیەو، ئەو سنوورەی جیای كردۆتەوە دەستكردە. وە لە شوێنێكی تریش لە چاوپێكەوتنێكدا لە دیلمان دەفەرموویێت: من بە باوەڕەوە ئەڵێم واز لە بستێك خاكی كوردستان ناهێنم[٩٥]. ڕێنماییكردن بە مانای دروستكردنی رامیاری و پلاندانانە، یان بەشێكە لە پلاندانان. وە مەبەست لە دروستكردنی رامیاری، دەسەڵاتی دەركردنی بڕیارو دیاریكردنی ئامانجەكانە[٩٦]. هەروەها سەركردەو فەرماندەكان لە دانانی رامیاری گشتی، بۆ گرووپ لە ئەستۆ دەگرن، ئامانجە ستراتیژی و تاكتیكییەكان دیاری دەكەن[٩٧]، ئەو كاتەی سەركردە دەسەڵاتی پێویستی لە دەست بێت، بۆ دەركردنی ڕێنمایی یان كۆمەڵە بنەمایەك و چەمكێك، بۆ ئەوەی پابەندی و ڕابەرایەتی ئەندامانی گرووپ بكات، لە گشت قۆناغەكانی قۆناغی كاركردن، یان جێبەجێكردنی پلانی داڕێژراودا[٩٨]. سەرچاوەی هەڵقولاوی ئامانجەكانی گرووپ بەم شێوەیەی خوارەوەیە :

---

[٩٣] د. محمد سليمان الطماوي، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق ص ١٧٤.

[٩٤] د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٤.

[٩٥] د. ناصح غەفور ڕەمەزان، چەند لایەنێك لە كەلەپووری نیشتمانی و خەباتگێڕانەی بارزانی نەمر، مەكتەبی ڕێكخستنی پێشمەرگە، زنجیرە (٥٠) چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٢، ل ٢١.

[٩٦] صالح محمد علي ابوجادو، المصدر السابق، ص ١٦٤.

[٩٧] د. طارق عبدالحميد البدري المصدر السابق، ص ٦٠-٦١.

[٩٨] د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦٠.

١- دەسەلآتی دەسەلآتدارە بەرزەکانی گرووپ و دەرەوە، فرمانەکان لە پلەی بەرزی سەربازی لە سەروو بۆ خواروەوە[٩٩]، یان کۆمەڵێك سەرکردە لەسەر ئاستی لووتکە، بڕیارەکانی ئەمانە کۆتایین لەسەر ئاستی نزم و خواروو، ڕێگەی مشتومڕو گفتوگۆکردنی پێ نادرێت[١٠٠].

٢- سەرچاوەکانی ژێرەوە هەڵقوڵاوی بڕیارەکانی ئەندامانی گرووپە بە گشتی[١٠١]، نوێنەرەکانیان، کە ئامانج و ڕامیارییەکان، دەخەنە بەر دەست سەروو، بەرپرسیاریەتی سەرکردایەتی لە ڕووکارکردنی ئەم ڕامیارییانە و، هاوبەشیکردنیان لە ڕاوێژو ڕا دەربڕیندایە[١٠٢]. یان سەرکردە خۆی لە لایەن گرووپەوە، ڕێگەی پێدراوە، بۆ وەرگرتنی بڕیارو بڕیاردان[١٠٣].

٣- سەرکردە کە لە دەسەلآتە بەرزەکان و گرووپدا ڕێگەی پێدراوە و سەربەخۆیە، لە بڕیاردانی ڕامیاریدا[١٠٤]، یان لە کاتی دیکتاتۆریەتیدا، لە باشترین باردا بێت، کە هەست بە لێهاتوویی یان توانایی لەسەر دیاریکردنی ڕامیاریدا دەکات، وە سەربەخۆیی لە دەرکردنی بڕیارەکانیدا دەبێت[١٠٥]، هەروەها بڕیاردانیش بە پشت بەستن لەسەر توانایی کەسایەتی سەرۆك دەبێت[١٠٦].

---

[٩٩] د.عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٤.

[١٠٠] صالح محمد علي ابو جادو، المصدر السابق، ص ١٦٤.

[١٠١] د. عبدالحليم عباس قشطة، المصدر السابق، ص ٥٤.

[١٠٢] صالح محمد علي ابو جادو. المصدر السابق، ص ١٦٤.

[١٠٣] د. طارق عبدالحميد البدري، المصدر السابق، ص ٦١.

[١٠٤] د. عبدالحليم عباس قشطة، المصدر السابق، ص ٥٤.

[١٠٥] صالح محمدعلى ابو جادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص ١٦٤.

[١٠٦] د. ابراهيم ياسين الخطيب واخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٣.

**٥- سەركردەو هەماهـەنگی Co - Ordinating** : لـەنێوان چـالاكی ئـەو كەسانەی كە لە ژێر فەرمانی سەركردەیەكدا كار دەكەن، بۆ جێبـەجێكردنی پلانـی دارێژراو، واتە هەماهەنگی كردنی سەركردەیە[١٠٧]. سەركردەش هـەموو كـات و توانایەكی خـۆی، بـۆ كـاركردن و كـاری سـەركردایەتی، بخاتـە گـەڕ نـەك توانـاو كاتەكەی، بۆ شتی لابەلاو كاری تر بێت[١٠٨]. چونكە پرۆسەی هەماهەنگی توانای هاوسەنگی كردنە لە نێو چالاكییەكانی ڕێكخـراودا، بـۆ بەدەسـتهێنانی ئامـانجی گشتی ڕێكخـراو بـە ئاسـانی و ئـەبێ توانایـەكی بـەرز هـەبێت[١٠٩]. هـەروەها هەماهەنگی كردن لە نێوان بەشەكان و بەڕێوەبەرایەتییـەكان و ئـەو تاكانـەی كـە ڕاسپێردراون، بە ئەنجامدانی ئیش و كارەكان[١١٠]. وە هەماهەنگی بەدەستهێنانی (تـەوافق) و هاوسـەنگی و نەهێـشتن و قەدەغـەكردنی دژە بۆچـوون و چـالاكییە جۆراوجۆرەكانە، لە ڕێكخراوی كارگێڕیدا، تا بە شێوەیەكی لە یەكچوون و گونجانی تـەواو بـەڕێوە بـچێت[١١١]. وە هـەروەها هەماهـەنگی كـردن بـە ڕەگـەزێكی بنچینەییەوە لە كاركردندا بـە تـەواوكاری دادەنرێـت، دووركەوتنەوەیـە لـە پێـك گەیشتنی دوولایەنی و دوو ڕوویی كـە دەبێتـە هـۆی سـەرنەكەوتن[١١٢]. لێـرەدا گرنگی پێدانی سەركردە، دەپرژێتـە سـەر ڕوونكردنـەوەی تایبەتمەنـدی پێكهاتـەی گــرووپ و، دیــاریكردنی، ڕۆڵ و بەرپرســیاریەتییەكان، لەســەر هەماهــەنگی پەیوەندییەكانی ناوەوەی گرووپ و گونجاندنیان و قەدەغەكردنی دەست تێوەردان، لە

---

[١٠٧] د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٧٥.

[١٠٨] د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة المصدر السابق، ص ٢٤٠.

[١٠٩] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق ١٩٨٣ ص ٣٢٤.

[١١٠] د. عبدالحميد محمود النعمي، مبادئ الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٥١.

[١١١] د. طارق مجذوب، الادارة العامة، دار الجامعة للطباعة والنشر، بيروت ٢٠٠٠ص ٥١٣ .

[١١٢] ا. د. طارق عبدالحميد البدرى، الاساليب القيادية والادارية، المصدر السابق، ص ٣٠.

ڕۆڵەکان و بەرپرسیاریەتییەکاندا، ئەم جۆرە سەرکردانە لە ئەندامانی گرووپ نزیـك دەبنەوەو پەیوەندی لە نێوانیاندا بە بەردەوامی و کراوەیی دەمێنێتەوە(١١٣).

**٦- چالاکی سـەرکردەو پەیوەندییـەکانی نـاوەوەو دەرەوە Reporting:**

سەرکردایەتی کارگێڕی داوای گواستنەوەی زانیاری و بـەیانات دەکـات، لـە سـەروو بـۆ خواروو، وە لە خوارووشەوە بۆ سەروو، لە چوارچێوەی ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوەکەیـدا، وە هەروەها کاری سەرۆکی کـارگێڕی بریتییـە لـە پێـدانی بـەیانات بـۆ سـەرۆکەکانی رامیاری، کە داوای دەکەن، وە گۆڕینەوەی زانیاری لەگەڵ ئەوانی تریشدا(١١٤). سەرکردە نابێت خاوەنی عەقلیەتی دواکەوتوویی هیـشك بێـت و، ڕووبـەڕووی گۆڕانکارییـەکان و پێشکەوتنەکان ببێتەوە، لە کاتی سەرکردایەتیکردنیدا، بەڵکو پێویـستە لەسـەری نـەرم بێت و بەرەو ڕووی پێشکەوتنەکان نەبێتەوە، وە ئامادەیی گۆڕانکـاری ئیجـابی و بـاش بێت، لە ڕووی کارکردن و شێوەکانی تەکنۆلۆژی نوێدا، کە دەپرژێنە هـەموو بوارەکـانی پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤایەتی، وە پەیوەندی باش دروست بکات، لەگەڵ ڕێکخراوەکان و سەندیکاکانی کرێکاراندا، وە لەگەڵ لایەنە جۆراوجۆرەکـانی حکومـەت، کـە بـە هـیچ شێوەیەك ناتوانێت واز لەم کاروبارانەی ڕێکخراوەکەیدا بهێنێت، لە ئاسانکاری ئەرکەکان و پێشخستنی کارەکانیاندا(١١٥). لەسەر سەرکردەی کارگێڕی پێویستە کار بکـات، بـۆ دۆزینەوەی تۆڕێکی باش و گشتی لە پەیوەندییەکاندا، لە نێوان یەکـەکانی ڕێکخـستن و لقەکانیدا، وە بەستنەوەیان بە ناوەندی سەرکردایەتی، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، وە کاری بـە پەلـە بکـات، لەسـەر نەهێـشتنی کۆسـپ و تەگـەرەکانی جێبـەجێکردن، وە بـاوەڕکردنی بـە جێگیربـوون و سـەقامگیری ڕێکخـستن و فراوانکردنـی درێژکردنـەوەی

(١١٣) ا. د. عمر احمد همشری، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦١ .

(١١٤) د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٧٥.

(١١٥) د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٢٤٠.

کەناڵەکانی پەیوەنـدی، لەگـەڵ دەرەوەی ڕێکخراوەکـانی ڕێکخـستندا[١١٦]. هـەروەها پەیوەندیکردن بە تاکەکانی ناو ڕێکخستن و لایەنەکانی دەرەوەی پەیوەندیـدار بـە کـاری ڕێکخستن[١١٧]. هەر بۆیەش پێویستە سەرکردایەتی کورد ئاگاداری پیلان و پیلانگێڕانی نـاوەوەو دەرەوە بێـت لـە کارکردنـدا، چـونکە دوژمنـان و داگیرکـەرانی کوردسـتان بەبەردەوامی خەریکی کارکردنن.

## چالاکی سەرکردەش لەم ڕووەوە دوو جۆرە :

١- سـەرکردە نوێنـەری دەرەوەی گرووپەکەیـەتی : لـە پەیوەنـدیکردنی دەرەوەدا نوێنەری فەرمی و باڵیۆزەکەیەتی، لە دەربڕینی پێداویـستییەکانیاندا، چـونکە زۆر گرانە لەسەر گرووپەکان، کە لەگەڵ گرووپەکانی تردا، ڕاسـتەوخۆ کـار بکـەن، بـە تایبەتی گرووپە بە ژمـارە زۆرو فراوانـەکان[١١٨]. وە ئـەم ئـەرك و پێویـستییانە سـەرکردە دەتوانێـت ڕاسـتەوخۆ دابینیـان بکـات، لـە چوارچـێوەی پاشـکۆ سەربازییەکان، یان لە چوارچێوەی کردارەکانی نامە ناردن[١١٩].

٢- سەرکردە نوێنەری دەسەڵاتی پەیوەندییەکانی ناوەوەیە : سـەرکردە لـە چوارچـێوەی ئەرکەکانیدا، بە ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نـاوەوەی گرووپەکەیـدا هەڵدەسـتێت، لـە پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی گرووپەکەیدا، جڵەوگرێکی کارتێکەرە، هەروەها بە ڕۆڵی ناوبژیکەر لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵەکەیـدا هەڵدەسـتێت، ئەگـەر هـاتوو گرژییـەك لـە

---

[١١٦] د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٣٢٥.

[١١٧] د. عبدالحميد محمود النعمي، مبادئ الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٥١.

[١١٨] د. طارق عبدالحميد البدری، الاساليب القياديـة والاداريـة فـی المؤسـسات التعليميـة، المصدر السابق، ص٦١.

[١١٩] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٦١.

نێوانیاندا دروست بوو یان سەری هەڵدا، کار لەسەر پەیوەندییە باش و رێکوپێکەکان و قووڵبوونەوە لە نێویاندا دەکات(١٢٠).

**٧- چالاکی دارایی Budgeting** : سەرۆکی کارگێڕی لە بەڕێوەچوون و جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیدا، بەرپرسیارەو پشت بە داهاتەکانی سنووری ژێر دەسەڵاتیدا دەبەستێت(١٢١)، بە پێی توانا ئاسانکردن و سووککردنی کارە ئاڵۆزەکانی و وەکارەکانی رێکخراویش، وە کورتکردنەوەی قۆناغەکانی کارکردن و ئاسانکاری و کەمکردنەوەی خەرجییەکانە لە کات و توانا بێ کەڵك بووەکاندا(١٢٢). هەر لە رێگەی چاودێریکردندا، سەرکردە لە جێبەجێکردنی پلان و رامیاری و پرۆگرامەکانیدا دەتوانێت دڵنیا بێت، کە دەبنە هۆی بەدەستهێنانی ئامانجەکانی رێکخستن و رێکخراوەیی. وە لەسەر سەرکردەش پێویستە لە کاتی چاودێریدا، بگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی تێکرایی بابەتییانە، دوور لە کەسێتی. وە هەستانی بە چاودێریکردن، بۆ دەرخستنی هەڵەکانی رێکخستن و زاڵبوون بەسەر ئەو کۆسپانەی کە کار لە جێبەجێکردنی ئامانجەکانی رێکخراوەیی و رێکخستن دەکەن. وە لە سەر سەرکردە پێویستە چاودێر بێت، بە مەبەستی هەڵسەنگاندن و چاکسازی، نەك لەسەر بنچینەی پێدانی سزاو سزادان(١٢٣). ئەرك و کاری دارایی بریتییە لە رێکخستن و راگرتنی پرۆسەی خەرجکردنی دارایی(١٢٤)، فەیلەسووفی چینی (کۆنفۆشیوس) گوتوویەتی: پێویستە میری بەوپەڕی رێکوپێکییەوە لە خزمەتگوزاری

---

(١٢٠) د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية فى المؤسسات، المصدر السابق، ص٦٢ .

(١٢١) د. سليمان محمد الطماوي، مبادئ العلم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ١٧٥.

(١٢٢) د. احمد حافظ نجم، مبادئ علم الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٢٤١.

(١٢٣) د. ابراهيم عبدالعزيز شيحا، الادارة العامة، المصدر السابق، ص ٣٢٥.

(١٢٤) د.عماد عبدالرحيم زغلول، ، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص ٦٩.

گەلدا بێت[١٢٥]. سەرەڕای ئەو تواناو ئەرکانەی سەرکردایەتی چەند ئـەرك و توانایـەکی تریش هەن لەوانە وەك:

١- **توانای جێبەجێکردن**: گرنگترین ڕۆڵـی سـەرکردە لـە گرووپـی کـاردا، زۆرتـر پێویستە کە بە دانانی پـلان بـۆ کارەکـانی گـرووپ و ڕێکخـستنیان و ئاراسـتەی رووکـار کردنیـان هەسـتێت[١٢٦]. پـاش ئامـادەکردنی پـلان و دابەشـکردنی بەرپرسـیاریەتی بەسـەر ئەنـدامانی کۆمەڵەکـەدا، هەڵدەسـتێت بەجێبەجێکردنیان[١٢٧]، وە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجـەکانیان کـە خـۆی بەرپرسـی سیاسـەتەکانە، لـە بەدواداچـوونی ئامانجـەکانی بەدەسـتهاتوو، ڕۆڵەکـەی لـە جێبەجێکردنی چالاکی گرووپدایە[١٢٨]. کـە زۆرتـرین جـار بەرپرسـیاریەتییەکەی بریتییە لە چاودێریکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتەکان، سـەرکردەی بـە توانـاش، گفتوگۆو مشتومڕی ئاراستە و ڕووکاری لە نێو هێڵی گونجاودایە، بـۆ ئەنجامـدان و ڕێگەگرتنی وا، کـەوا ببێتـە بەدەسـتهێنانی ئامـانجی هاوبـەش، وەك سـەرکردەی تیپێکی سەربازی کە لە دەرکردنی فرمان و جێبـەجێکردنی ئەرکـەکانی ڕۆژانەیـدا بەرپرسیارە[١٢٩]. ئەرك و کـاری سـەرکردە هێنـانی چـەك و تەقەمـەنی و چـەکی

---

[١٢٥] مایکـل هارتـك. وەرگێڕانـی: ئەسـعەد قـەرەداغی، ١٠٠ کـەس، چـاپخانەی الادیـب البغدادیة ـ چاپی دووەم، ١٩٩٠، ل ٣٤.

[١٢٦] د. عمر احمد همشری، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق ص٢٥٩.

[١٢٧] ا.د. طارق عبدالحميد البدري، الاسـاليب القياديـة والاداريـة في المؤسـسات التعليميـة، المصدر السابق، ص٦١.

[١٢٨] د. ابراهيم ياسين الخطيـب وآخـرون، التنـشئة الاجتماعيـة للطفـل، المـصدر الـسابق، ص١٢٣ .

[١٢٩] د. عبدالحليم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٣.

پێشکەوتووش و ئـامرازو کەلوپـەل و پێداویـستییەکانی تـریش دابـین بکـات، وە دابەشکردنیان بەسەر جەنگاوەراندا، وە گەیاندنی ئاو و خواردەمـەنی....هتـد بـۆ بەرەکانی شەڕ و سەنگەرەکان(١٣٠). هەروەها سەرکردە بۆی هەیە کە هەنـدێك لـە ئەندامانی نزیکی خۆی ئەرك و فرمانیان پێ بـسپێرێت و دەسـەڵاتیان بـۆ دیـاری بکات، لە هاوکاری و یارمەتیدانیدا(١٣١).

**٢- سەرکردە وەك شارەزایەك :** سەرکردە هەموو کات جیاوازە لە خەڵکی تـر، سەرچـاوەی زانـست و زانیـاری و شـارەزایی هونـەری و کـارگێڕی و بەڕێوەبردنی کارەکانی گرووپەکەیەتی، چونکە زۆرترین جار دەبینین یـەکێك بە باشترین زانست و هونەر کارگێڕییە پێویستییە لکاوەکـانی گرووپەکـەی ڕاستەوخۆ دەکەوێتـە دەسـت و دەردەکـەوێت. بـەڵام لـە گرووپـی گـەورەدا دەبینرێت کـە تایبەتمەنـدی و پـسپۆڕی جۆراوجـۆری تێدایـە، هـەر بۆیـەش سەرکردەکان پشت بە هونەرییەکان و پسپۆڕەکان دەبەسـتن، بـۆ ئەنجامـدانی لایەنی چالاکی جۆراو جۆر لـە نـاو گرووپەکانیانـدا(١٣٢). سـەرکردەش وەك شـارەزایەك بـە کارەکـانی هەڵدەسـتێت و ڕاوێـژکاری ئەنـدامانی گرووپەکەیەتی(١٣٣).

---

(١٣٠) د. احسان محمد الحسن، علم الاجتماع العسكري، المصدر السابق، ص ١٦٠.

(١٣١) صـالح محمـد علـي ابوجـادو، سـيكولوجية التنـشئة الاجتماعيـة، المـصدر الـسابق، ص ١٦٤.

(١٣٢) د. عبـدالحكيم عبـاس قـشطة، الجماعـات والقيـادات، المـصدر الـسابق، ص ٥٤، بـۆ هەمان مەبەست بڕوانە: د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية، المـصدر السابق ص ٦٠ .

(١٣٣) د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦١ .

**٣- سەرکردەو بەرزکردنەوەی دروشمەکانی گرووپ:** لە پێناوی داکۆکیکردن و پاراستنی گرووپە جۆراوجۆرەکان، هێزو توانای گرووپ بە تین دەبێت لە کارە نایابەکانیدا، کە ئەنجامی دەدات(١٣٤). لە ڕاگەیاندن و بەرزکردنەوەی بەرنامەی کارو جێبەجێکراوەکانی تەواو بوو، کە لەوانی تر جیای دەکاتەوە، ڕەنگدانەوەی هێزو تواناییانە لە بەرزکردنەوەی هەندێك لە نیشانە و دروشم یان دەربڕیندا، یان پەرچەمی ڕەنگاوڕەنگ، کە جیاکەرەوەیە لە هەوڵدانی گرووپ بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان، وە لەسەر سەرکردە پێویستە کە بە هاوکاری و یارمەتی و هەماهەنگی گرووپ، ئەم دروشم و نیشانەو دەربڕینانەی گرووپ بەرزی دەکاتەوە دیاری بکرێت و پارێزگاری و بەرگرییان لێ بکرێت، کە ئەم دروشم و دەربڕینانە ڕەنگدانەوەی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانیان بێت(١٣٥). وەك بەرزکردنەوەی دروشمی (یان کوردستان یان نەمان، یان بەرزکردنەوەی دروشمی یەکێتی فیدراڵی بۆ خاکی عێراق لە پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٦/٤.) یان بەرزکردنەوەی دروشمی یەکێتی نیشتمانی لە ئەردەن وەیان گرانترین و بەنرخترین سامانمان کە هەمانبێت مرۆڤە(١٣٦).

**٤- توانای دادوەریی و ناوبژیکەر:** سەرکردە لە ئەرکە گرنگ و بنچینەییەکانیدا کارکردنە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و نەهێشتنی دووبەرەکی، وە قەدەغەکردنی زیادەڕۆیی دەسەڵاتدارەکان و بەرپرسەکان، بەمەبەستی دابینکردنی ئامانجەکانی بەدەستهاتوو بۆ گرووپ. ئەگەر هاتوو ناوبژی و ئاشتبوونەوە سوودی نەبوو دەتوانێت بە لێپرسینەوەی یاسایی پێویست هەڵبستێت و بە پێی یاساکانی ناو کۆمەڵگاکە فرمان و

---

(١٣٤) صالح محمد علي، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص ١٦٥.

(١٣٥) ا. د. عمر احمد همشرى، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦١.

(١٣٦) د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٤.

بڕیــاری بابەتییانــە دەربکــات[١٣٧]. هەریەکــەو مــافی خــۆی پــێ بــدرێت و ســزای سەرپێچیکەر و دوژمنکار و هێرشـبەریش بـدات[١٣٨]. ئەمــە تــەنها بــۆ دادوەرێکــی ویژدانی نییە، بەڵکو بۆ ناوەندی دروستبوونی پەیوەندییە چـاك و باشـەکانە، لـە نێـوان ئەندامانی گرووپدا. لێرەدا ڕۆڵی سەرکردە دەردەکـەوێت لـە سـووککردن یـان هانـدانی دووبەرەکی و ململانێ لە ناو گرووپدا، ئەمەش زیـاتر لەسـەر ئامانجـەکانی کەسـایەتی سەرکردە دەوەستێت[١٣٩]. چونکە پێویستە سەرکردە تەماشای خواروی خۆی بکات کە لە گەڵی کار دەکەن، نەك لە لای کار دەکەن، وە ئاگادارکردنــەوەی هــەر تاکێــك بــە بەهاکەی و گرنگییەکەی لە جێبەجێکردنی ئەرك و کاری ڕێکخراوەیی و بەردەوامی لە جووڵانەوەکەیدا[١٤٠].

**٥- ئەرکی باوکسالاری سەرکردە:** سەرکردە وەك باوکێك ڕۆڵی چـاودێری گـشتی ئەندامەکانی گرووپ دەکات، کار بۆ هەستە هەڵچووە باشەکانی تاکەکان دەکـات، نیشانەی نموونەی پەڕینەوەو گۆڕینە بۆ هەستی ڕەزامەندی و گوێڕایەڵی[١٤١]. کـە هەندێ تایبەتمەندی و خەسڵەتی کەسێتی، یان هەڵچوونی بـاش لـە سـەرکردە پـێ دەگات و گەشە دەکـات، هەنـدێك لـە ئەنـدامان لـە ڕوانگەیانـەوە دەبیـنن، کـە سەرکردە وێنەیـەکی باوکـە و سەرچـاوەی سـۆزو دڵنـەوایی و پەنـدە کـە پـەیڕەو بکرێت[١٤٢]. بەڕۆڵی باوکایەتی و مرۆڤایەتی هەڵدەستێت، بۆ گشت ئەندامێك لە

---

[١٣٧] صالح محمد علي ابوجادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص ١٦٥.

[١٣٨] ا.د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق ص ٢٦٢.

[١٣٩] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق ص ٥٥.

[١٤٠] د. طارق المجذوب، الادارة العامة، المصدر السابق ص ٤٩٣.

[١٤١] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق ص ٥٥.

[١٤٢] صـالح محمـد علـي ابوجـادو، سـيكولوجية التنـشئة الاجتماعيـة المـصدر الـسابق، ص ١٦٤ .

کۆمەڵەکەدا، ئاشنایی بارودۆخ و ئێش و ئازاری کەسێتییەکەی دەبێت، وەك ئەوەی خۆی خاوەنی گرفتەکان بێت، لە چارەسەرکردنی گرفتەکانـدا یارمەتیـدەر دەبێـت. ڕۆڵی چاودێری و لایەنگری دەبێت و گرنگییان پـێ دەدات. چـاودێری بەرژەوەنـدی تاکەکان دەکات، وە ئەم پەیوەندییەش گرنگە لە نێوان سەرکردەو لایەنگرانیـدا، وە ئەم ڕۆڵە زۆر زیندووەو کاریگەرە [١٤٣].

**٦- سەرکردە سەرچـاوەی ئایدۆلۆجییـە:** پێویـستە سـەرکردە زانـستی هۆشـیاری هەبێت، بۆ ئـەوەی بتـوانێ ببێتـە سەرچـاوەی بابەتییانـەی بیروباوەڕەکـانی تاکـەکانی گرووپەکەی، بە ویژدانێکی زیندوو سەرکردەیەکی گیانی بێت، لە پێناوی گەیاندنی بـەها و ڕەفتارە ڕاستییەکان بۆ ئەندامانی گرووپ کـار بکـات[١٤٤]. هـەروەها سـەرکردە لـە هەندێك کاتدا ئایدۆلۆژیای ئەندامیەتی گرووپەکەی دیـاری دەکـات، وەك : سەرچـاوەی بەها و بیروباوەڕەکانی تاکەکان کار دەکات[١٤٥]، زۆرتـرین جـار سـەرکردەی سـەربازی دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ، لـە سەرچـاوەکانی بـیری و ئایـدۆلۆجی و فەلـسەفی کـە گرووپەکە لەسەری دەڕوات، سەرکردە بیرۆکە و ئایدۆلۆجییەکە دادەڕێژێت، دەیگەیەنێتـە ئەندامـەکانی کـە بیروباوەڕەکـان و بـەهاکان و جـۆری ڕەفتارەکانیـان و هەڵـسوکەوتی ڕۆژانەیان دیاری دەکات[١٤٦]. سەرکردە دەبێتە سەرچاوەی زۆربەی هـەرە زۆری بـەها و بیروباوەڕەکـان، پێغەمبـەری ئیـسلام *محەمـەد* (د.خ) سەرچـاوەی ئایدۆلۆجییـە لـە ئیسلامدا، وە هەروەها سەرکردە بەم ئەرك و کارانەش هەڵدەستێت[١٤٧]:

---

[١٤٣] ا. د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية، المصدر السابق ص ٦٢.

[١٤٤] هەمان سەرچاوە ل٦٠.

[١٤٥] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق ص ٥٥.

[١٤٦] د. احسان محمد الحسن، علم الاجتماع العسكري، المصدر السابق، ص ١٦١.

[١٤٧] د.ابراهيم ياسين الخطيب والاخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٤.

أ- ڕێنماییکردن بۆ ڕەفتارکردنی لایەنگران لە ناو کۆمەڵگاکەیاندا .

ب- ڕێکخستنی پڕۆسەکانی ئاوێتەبوون لە نێوان گرووپ و تاکەکانیدا.

ج- پاراستنی یەکگرتوویی گرووپ.

د- دەست پێکردن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، کە لە ئەنجامی ئاوێتەبوونی گرووپ دەردەکەون .

هـ- ئاسایی کردنی داهاتەکانی گرووپ و دەسەڵاتەکانی سەرکردە .

**٧- بەرپرسیاریەتی سەرکردە:** ئەگەر هاتوو هەڵەیەك ڕووی دا لە هەندێك ئەندامانی گرووپ و بووە هۆی دەرکەوتنی ئەم گرووپە، بە شێوەی کەمتەرخەم و بێ توانایی، لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی و بەرپرسیار بوون بەرامبەر کۆمەڵگا. سەرکردە خۆی تووشی ڕەخنە یان سزا دەبێت لە ڕێگەی دەسەڵاتی بەرز، ئەریك فرۆم (From) خاوەنی پەرتووکی (ترسان لە ئازادی) ئاماژە دەکات و دەڵێت خەڵکەکە ئامادەیی پشتگیری بەرپرسیارە ترسناکەکانیان هەیە، بۆ سەرکردەکانیان، هەوڵدانێکی ڕاکردنە لە بەرپرسیاریەتی تاکەکەسیدا، بە پێی فرمانی ئەم بەرپرسیاریەتییە، سەرکردە بەرگری لەم گرووپە و هەڵەکانی هەندێك لە ئەندامەکانی کە تێی کەوتووە دەکات، کە بوونەتە هۆی ئاراستەکردنی ڕەخنە لە گرووپ بە گشتی[١٤٨].

**٨- سەرکردە هێمای گرووپە:** سەرکردە هێمای یەکێتی گرووپە، لە جێبەجێکردنی ئەرکەکان و بەردەوامییاندا[١٤٩]. هەر وەك چۆن (جەواهر لال نەهرۆ) هێمای یەکێتی و یەك ریزی گەلانی هیندستان بوو، بۆ رزگاری خاکی هیندستان، (جەمال

---

[١٤٨] صالح محمد علي ابو جادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، المصدر السابق، ص١٦٦.

[١٤٩] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢١.

عەبد ئەلناصر)یش هێمای یەكێتی خەبات و بەرگری میسری عەرەبییـە. هـەروەك چۆن (مەلا مستەفای بارزانی) هێمای یەكێتی ڕیزەكانی گەلی كـوردو بزووتنـەوەی ئازادیخوازی شۆڕشی ئەیلوولی مەزن بووە. ئێستاش چۆن مەرجەعیـەتی شـیعەكان لە عێراقدا هێمای گرووپ و مەزهەبەكانی شـیعەیە، نموونـەش سیـستانی هێمـای یـەكێتی و یـەك ڕیـزی زۆرینـەی شـیعەكانی عێراقـە لـەم ڕۆژگـارەدا. هـەر وەك نموونەیەكی زیندووی مێژوویی چۆن (ئەدۆلف هتلەر ) هێمای نازییەت و داگیركاری و، بەرزكردنەوەی ڕەگەزی ئاری بەسەر گشت ڕەگـەزەكانی تـرو میللـەتانی تـر لـە ئەڵمانیا و گشت جیهاندا بوو(١٥٠).

## باسی دووەم

### یەكەم: ڕەگەزەكانی سەركردایەتی

بـۆ وەرگرتنـی كـاری سـەركردایەتی هـەبوونی ڕەگـەزە بنـچینەییەكانە، بـۆ تەواوكاری و شێوەی كاركردنی سەركردایەتی، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی هاوبەش، بنـچینەكەشی هاوبەشـیكردنی سـەركردەو لایەنگرانـە . بـوونی خەسـڵەتی سەركردایەتی لە كەسێكی دیاریكراودا، مانای وانییە كە ببێتە سەركردە، چـونكە سروشتی سەركردایەتیكردن پێویستی بە بـوونی لایـەنگران هەیـە. سـەركردایەتی پرسێكی ڕێژەییە، بوونی گرووپێكی خەڵك مانای بـوونی سـەركردە نییـە، بـەلاّم پێویستە لێرەدا ئامانجێك هەبێت كە ئەو گرووپـە هـەوڵی بـۆ بـدات. لـەم ڕووەوە سـەركردایەتی دەردەكـەوێت لـە ئـەنجامی بارودۆخەكـە، یـان هەڵوێـستە

---

(١٥٠) اودلف هتلر، كفاحي، ترجمة: لويس الحاج. مطبعة الراية، بغداد، العراق، ١٩٩٠، ص ١٦٠.

کۆمەڵایەتییەکان، بۆ گەیشتن بە ئامانجـەکان، سـەرکردەو گـرووپ هەڵدەسـتن، بـە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە، کاتێك ئەم بنچینانەی خوارەوە بوونیان هەبێت .

**١- سەرکردە** : سەرکردە بە بناغەو بنچینەیەکی سەرەکی دادەنرێـت، لـە پرۆسـەی سەرکەوتنی سەرکردایەتیکردندا، ڕۆڵێکی باڵا دەگێڕێت. سەرەڕای ئەمـەش ڕۆڵـی سـەرکردە، جیـاوازو جیایـە و دەگۆڕێـت، لـە پرۆسـەی سـەرکردایەتیکردندا، لـە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر . یان لـە پرۆسـەی سـەرکردایەتییەکەوە بـۆ پرۆسـەی سـەرکردایەتییەکی تـرەوە[١٥١]. سـەرکردەش تـاکێکی کۆمەڵـە، خەسـڵەتی جیاکەرەوەی تیا بەدی دەکرێت، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی کۆمـەڵ و گـرووپ، هـەرەوەزی و هاوکـاری لەگەڵـدا دەکـات. خۆشەویـست و ئارەزوومەنـدی گرووپەکەیەتی، چ بە گشتی یان بـە زۆرینـە بێـت[١٥٢]. سـەرکردەش کەسـێکە و پایەیەکی گرنگی لە نـاو گرووپـدا هەیـە[١٥٣]. هـەروەها بـە کاکـڵ و نـاوەڕۆکی پرۆسـەی سـەرکردایەتی دادەنرێـت. ڕەگـەزەکانی سـەرکردایەتیکردن بـەم چـەند جیاکەرەوە گرنگانەی خوارەوەش دیاری دەکرێت:

١- سەرکردە ئەندامێکە و، وەك هێمایەکی پایە بەرز، لـە نـاو گرووپەکەیـدا کـار دەکات .

٢- پێویستە سەرکردە توانای دروستکردنی، گیانی تـەبایی و ورە بـەرزی لـە نـاو گرووپەکەیدا هەبێت .

---

[١٥١] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، مصدر السابق، ١٩٨١، ص ٥٨.

[١٥٢] د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية في المؤسسات التعليمية، المصدر السابق، ص٥٢.

[١٥٣] ا.د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦٣.

٣- سەرکردە سادەو ساکارو نەرم بێت، توانای گونجاندنی، بەپێی بارودۆخ و هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانی هەبێت .

٤- ڕەوشت بەرزو توانای بەهێزی، بۆ سەرکەوتنی گرووپەکەی، لە کارو چالاکی و تێگەیشتنی ڕووکارەکاندا هەبێت[١٥٤].

٥- توانای ڕێکخستنی بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی هەبێت، لە پێویستییەکان و ئارەزووەکانی گرووپەکەی تێ بگات .

٦- پلان و نەخشەی سوودمەند، بۆ هاوکاری و هەماهەنگی، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی گرووپ دابڕێژێت[١٥٥].

**٢- لایەنگران** : بێ گومان لایەنگران کار لە ڕەفتاری سەرکردەکانیان دەکەن[١٥٦]. کۆمەڵە تاکێکن ئاوات و، ئارەزووی ڕەواو، نزیك و، لەیەکچوو لە هەڵوێستەکانیان و، ڕووکارەکانیاندا، هەڵقوڵاوی هەیە. بۆ بەدەستهێنانیان لە شێوەی ئامانج کۆدەبنەوە و، هەر ئەندامەو بەشێك لە بەرپرسیاریەتی، لە ئەستۆ دەگرێت، لە ژێر سەرکردایەتییەك، بە باوەڕێکی پتەوی تەواو کۆ دەبنەوە[١٥٧]. لایەنگران بنچینەیەکی گرنگن، لە هەڵوێستەکانی سەرکردایەتیکردندا، سەرکردەش لە گەشەکردن و گونجاندن و بەهێزکردنی لایەنگرانی مکوڕ دەبێت، بە مەبەستی لێك نزیککردنەوەی ئاستەکانی، خوێندن و، باری ئابووری و کۆمەڵایەتی، سەرکەوتنی

---

[١٥٤] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص١٢٥.

[١٥٥] ا. د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦٣.

[١٥٦] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٥٩.

[١٥٧] د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية في المؤسسات التعليمية، المصدر السابق، ص٥٢.

لایەنگران پەیوەنداره بە لێهاتوویی سەرکردەکان، وە توانـای تاکـەکانی گـرووپ و جۆری پەیوەندییەکانیان، لە بیروبـاوەڕە تایبەتمەندییـەکانی نـاو گـرووپ، پێکـەوە دەبەستێتەوە[١٥٨]. هەرچەندە گونجاندن و ڕێکوپێکی لە نێوان ئەندامانی گرووپـدا هەبێت، ئەوەندەش دەرکەوتنی گرفتـەکان نـزم و کـەم دەبێتـەوە، لـە نێوانیانـدا. ئەمەش دەبێتە دەرفەتی زیاتر، بۆ سەرکەوتنی پرۆسـەی سـەرکردایەتی و، گیـانی تەبایی و، ورە بەرزی، لە نێوان لایەنگران و سەرکردەکانیاندا[١٥٩].

**٣- کێشە :** چالاکییەکە کە گرووپ کار لە پێناوی بەجێگەیانـدنی و، خـەبات بـۆ بەدەستهێنانی دەکات، جا چ ماوەکە درێژ بێـت، یـان کـورت بێـت، هـەر تاکـەو بەشێکی دیاریکراو، لە بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆی خۆی دەگرێت . ڕازیبوونی خۆی دیـاری دەکـات، لـە چوارچـێوەی قوربانیـدان، بـۆ ئـەو ئەرکـەو لەسـەر تیـشکی ڕێنماییەکان، لە لایەن سەرکردەوە، متمانەو باوەڕی تەواو، لەسەر ئیش و کارەکان و جێبەجێکردنیان دەبێت[١٦٠].

**٤- ئامانج:** لەسەر ئەندامانی گرووپ پێویستە ئامانجی هاوبەش دیاری بکـەن، وە کار بۆ بەدەستهێنانیان بکرێت. ئەگینا تووشی گرفتـی هاوبـەش دەبـن، پێویـستە هەوڵ و کۆشش لە پێنـاوی چارەسـەرکردنی گرفتـە هاوبەشـەکان بکـەن. ئەمـەش ڕوونکردنەوەی ئامانجە گرنگەکان و دیاریکردنیانە، یان کێشەو گرفتی هاوبەشە کە تووشیان هاتووە. بۆ دۆزینەوەو چارەسەرکردنیان، زاڵبوون بەسەر ئەم گرفتانـە، لـە

---

[١٥٨] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٥.

[١٥٩] ا. د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦٤.

[١٦٠] د. طارق عبدالحميد البدري، الاساليب القيادية والادارية في المؤسسات التعليمية، المصدر السابق، ص٥٢.

چوارچێوەی ڕەگەزەکانی پرۆسەی سەرکردایەتیدا(١٦١). پێویستە لـە نـاو گرووپـدا ئامانجی نەرم و ساکارو توانای بەدەستهێنانیان هەبێت، تاکـەکان باوەڕیـان پێیـان هەبێت، پێکهاتەی پەیوەندی کەسایەتی لە ناو گرووپدا، ئاڵوگۆڕ بێت، فەرمانێکی گرنگە لە سەرکەوتنی نەتەوەکەدا، لەو ژینگە سروشتییەی کە تێیدا دەژییێت(١٦٢).

بۆ بەدەستهێنانی ئامانج یان پێگەیشتنە، مەبەستیش (Targets) کۆشـشی گرووپە، وە پێویستە ئەم ئامانجانە دیاریکراو و ڕوون و ئاشـکرا بـن، تەمومـژاوی نەبن، هەڵقولاوی ناوجەرگەی کۆمەڵگا بن، توانای بەدەستهێنانیان هەبێت، لەگـەڵ بارودۆخ و گۆڕانکارییەکانی ناو کۆمەڵگادا بگونجێت و بگۆڕدرێت(١٦٣).

**٥- هەڵوێـستی سـەرکردایەتی:** مەبەسـت لـە هەڵوێـستی سـەرکردایەتی، هـەموو بارودۆخێکی ژینگەیی و کۆمەلآیەتییە، دەکەوێتە چوارچێوەی پرۆسـەی سـەرکردایەتی، وە کار لە ماوەی سەرکەوتنی دەکات. لە وانەی کە سەرچاوەکانی کۆمەلآیـەتی لـە خـۆ دەگرن، لە پێکهاتەی کۆمەلآیەتی و بارودۆخی ماددی و قـەوارەی بکـەرەکان، یـان لـە هەڵوێـستی ئەندامانـدا و کـاتی ئاوێتـەبوون و مێـژووەکانیان ...هتـد. هەڵوێـستی سەرکردایەتی دەگۆڕدرێت ئەگەر گۆڕانکاری بەسـەر ئامانجـەکانی گرووپـدا هـات، وەك گۆڕانکاری لە یەکێتی ڕیزەکانی گرووپدا، یان لە پەیوەندی تاکەکانیـدا، یـان بـە هاتنـە ڕیزی ئەندامانی نوێ، یان دەرچوونی چەند ئەندامێك لـە نـاو گرووپەکەیانـدا، یـان بـە پاڵەپەستۆ و بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ گرووپ و لایەنانی تردا بێت(١٦٤).

---

(١٦١) د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٦٠.

(١٦٢) د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٢٠.

(١٦٣) ا. د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ٢٦٤.

(١٦٤) هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٥.

**٦- ئاوێتەبوونی کۆمەڵایەتی ئاڵوگۆڕ:** بناغەو بنچینەی هەموو پەیوەندییەکی ناو گرووپ، ئاوێتەبوونی کۆمەڵایەتی ئاڵوگۆڕە، بە کاکڵ و ناوەڕۆکی پرۆسەی سەرکردایەتیکردن دادەنرێت. بۆ ئەوەی ئاوێتەبوون لە نێو ئەندامانی گرووپ ڕووبدات، پێویستە پێکگەیشتن لە نێوانیاندا ئەنجام بدرێت و هەبێت[١٦٥]. پشت بە گەیاندنی نێوان تاکەکان و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانیان دەبەستێت. واتە: ڕازیبوون بە ئاوێتەبوونی پێویستییەکانی کەسێك، کە لە گەڵیدا ئاوێتەو تێکەڵ دەبێت. چونکە ڕەزامەندی بنچینەی ئاوێتە و تێکەڵبوونەکەیە[١٦٦]. گەیاندن هۆکارێکی ئاوێتەبوونە، لە نێوان ئەندامانیدا، لە بەر ئەوەی کارتێکردنی ئاڵوگۆڕە، دابینکردنی ڕەفتاری هەردوو لایەنە (سەرکردەو ئەندامانی گرووپ) ئەمەش لە ڕێگەی گەیاندن جێبەجێ دەکرێت . گەیاندن هۆکارێکی تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونە، لە نێوان ئەندامانیدا، بۆ زیاتر زانیاری ئاوێتەبوون، قووڵترە لە گەیاندن. نموونەش زۆرجار پێکگەیشتن لە دوولاوە ڕوودەدات، بەلام ئاوێتەی یەکتر نابن، چونکە ئاوێتەبوون بە مانای ڕازیبوون و ناساندن و وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی لایەنی دووەمە، کە لە گەڵیدا ئاوێتە دەبێت[١٦٧].

## دووەم: سەرچاوەی هێزی سەرکردایەتی

سەرچاوەکانی هێز بریتییە لە هێزو توانای کارتێکردنی کەسێك لە ڕەفتاری کەسێکی تردا، سەرکردەش هێزو توانای کارتێکردنی لە لایەنگرانیدا، لە چەند سەرچاوەی جۆراوجۆری سەرکردایەتیکردندایە کە بریتین لە :

---

[١٦٥] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٦٠.

[١٦٦] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص١٢٥.

[١٦٧] ا. د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٦٥.

**١- كەسایەتی سەرکردە:** سەرچاوەی هێزی سەرکردایەتی هەر سەرکردەیەك هەڵقوڵاوی کانگای هێزو توانای لایەنگران و دەست و پێوەند و ئەڵقە لە گوێکانیەتی، بــە هــەبوونی خەسڵەتە چاکەکانی کەسایەتی سەرکردە لــە: (زانــست، ڕەســەنی، گــران و ســەنگینی، دڵسۆزی، یەکسانی، بــاوەڕی و متمانــە بــەخۆبوون ...هتــد) هــەر بۆیــەش پــشتگیری ســەرکردایەتیکردنی لیّ دەکرێــت[١٦٨] . جیاکــەرەوە کەســایەتییەکانی ســەرکردە لــە شوێنێکەوە بــۆ شــوێنێکی تــر جیــاوازە، وە لــە گرووپێکــەوە بــۆ گرووپێکــی تــرو لــە کۆمەڵگایەکــەوە بــۆ کۆمەڵگایــەکی تــریش جیــاوازی جۆراوجــۆری جیاکــەرەوەکان بەدەردەخەن . گریمان لە جێگیرکردنی هەندێك فاکتەری تردا ئەگەر کەسێك لە شــوێنێك پایەیەکی ناوەندی و سەرنجڕاکێشی ناوەندی هەبێت، هەلی گونجــاوتری بــۆ دەڕەخــسێت، ببێتە سەرکردە لەم شوێنە پێویست و گونجاوانەی کە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی دەبــن .هێــزو توانای دەربڕین و ئاخاوتنی کەسێك، سەرنجی کۆمەڵەکەی بۆ لای خۆی ڕادەکێــشێت. بەتایبەتی کەسێکی زیرەکی ڕەوانبێژ و قسەکەرێکی لێهاتوو لە نــاو گرووپــدا، بــۆ ئەوەی لە کۆڕو ســیمینارو کۆبوونەوەکانــدا ســەرکردایەتی بکــات. هــەر ئەمــەش هاندەرێکە بۆ ئەوەی ببێتە سەرکردە لەم بوارەدا، چونکە وتەی کاریگەرو بەنرخ زۆر گرانترە، لە زۆر ئاخاوتن و وتەی بیّ کاریگەرو بیّ نرخ[١٦٩] .

**٣- لاسایی:** زۆرجار هەندێك لــە ســەرکردەکان کەســایەتی ســەرکردایەتییان تێــدا بــەدی ناکرێت، هەر بۆیەش ناچار دەبن لاســایی ســەرکردەکانی پێــشووتر بکەنــەوە لــە ئــەرك و کارەکانیانــدا، وەك پەنــدێکی پێــشینان دەڵێــت: ﴿میراتگــری ســەرکردایەتی (بنــچینەی ســەرکردایەتیکردنە)﴾ ئەمــەش زۆر بــەڕوون و ئاشــکرایی، بــە تایبــەتیش لــە دەزگــا

---

[١٦٨] هەمان سەرچاوە، ل ٢٧٢.

[١٦٩] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٧٧.

ئابوورییەکان و کۆمپانیاکانی ولاّتە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکادا دەردەکـەوێت، کـە بـە تێرمی ئیمپراتۆریـەتی کارەکـانی بازرگـانی دەناسـرێن. زۆر جـاریش میراتگـری لەسـەر بنچینەی تەمەن دەبێت، بە تایبەتیش لە لاساییکردنەوەو دانانی سەرکردایەتیدا، لە ژیـانی بەڕێوەبردنی هـۆزو کۆمەڵـە مرۆڤایەتییەکانـدا . زۆرجـاریش کـوڕ لـە شـوێنی باوکیـدا دادەنرێت، لاسایی لە هەڵسوکەوت و کارگێڕی و بەڕێوەبردن دەکات[١٧٠].

**٣- پسپۆڕایەتی تایبەتی سەرکردە:** مرۆڤی خاوەن بیرو هوشیارو ڕۆشنبیرو زیرەك، زۆر ئاسان نییە، کاری تێ بکرێت لە هەڵبژاردنی سـەرکردە دیاریکردنـدا. چـونکە هێزو تواناو لاسایی و دوور لە ڕوانگـەیی و کارەسـاتی لـە ناکـاو و ڕووداوەکـان و کەسایەتییەکان کاری تێ ناکـەن . بـەڵکو ئـەو مرۆڤـە زۆر باشـتر دەزانێـت، لـە کەسـێکی پـسپۆڕو شـارەزایی تایبـەت، لـە بـوارێکی دیـاریکراوی تایبـەت سەرکردایەتی جێبەجێکردن بکات. (هیمان) باوەڕی وایە شارستانیەتی مرۆڤایـەتی تاکو ئێستاش لە سۆزو زیرەکی دوورە لە سۆزو زیرەکی پێگەیشتوو، لە بەر ئـەوەی بنـچینەی سـەرکردایەتیکردن، لـە ناوەنـدەکانی زانستیـشدا، پـشت بەپایـەی کۆمەلاّیەتی و ڕابردووی بنەماڵـەو خێـزان و کـاری ناکـاو و ئارەزوومەندانـە، لـە سەرکردایەتیکردندا دەبەستێت[١٧١]. سەرچاوەی هێزی سەرکردایەتی، هـەڵقولاّوی پسپۆڕیەتی پیشە هونەرییەکانە، شارەزایی تەواوی لە بـواری پـسپۆڕیەتی بـیری و کۆمەلاّیەتی و مرۆڤایەتییەکاندا هەبێت. کە لایەنگرانی پێویستییان پێـی هەیـەو دەبێت. سەرکردە دەبێت هێـزو توانـای تـەواو و شـارەزایی و پـسپۆڕیەتی لەسـەر بەڕێوەبردنی کارو کارگێڕیەتی کۆمەڵەکەیدا هەبێت. شارەزایی لـە چارەسـەرکردنی

---

[١٧٠] بڕوانە: **هەمان سەرچاوە**، ل ٧٨.

[١٧١] بڕوانە: **هەمان سەرچاوە**، ل ٨٠.

گرفتــەکان و بڕیــاردان، پەیوەنــدیکردن، هونــەری هەڵــسوکەوتکردن، شــارەزایی، پێکهێنانی تیپ، شارەزایی لە تەنگژەکان، گفتوگۆکردن...هتد هــەبێت ئەمانــەش زیاتر باوەڕی بوون و متمانــەی ئەنــدامانی گــرووپ وکۆمــەڵ و کۆبوونــەوەیان لــە دەوریدا بە سەرکردەکەیان دەبەخشێت. بەسەرکردەی دڵسۆز و خۆشەویستی خۆیــان دایبنێن[172].

**٤- هێزی نا ڕوانگەیی:** تایبەتە بە هێزی جادوویی و دوور لە ڕوانگــەیی کــە دوو بیردۆزەکەی تیۆری پاڵپشتیان دەکات ئەویش:

١- حەتمییەتی پێشکەوتنی رۆشنبیریی لە لایەن سەرکردەوە، چونکە سەرکردەکان بە هۆی بارودۆخ و هەڵوێستە کۆمەلآیەتییەکان دروست دەبن، ئەگەر بارودۆخەکــەیان و هەڵوێــستە کۆمەلآیەتییەکە پێویستی بە بوونی سەرکردەیەکی مەزن هــەبوو، بێــشك ســەرکردەیەکی مەزن و ناودار لەم کات و سات و هەلــەدا دەردەکــەوێت ئەمــەش لــە ئــەنجامی دوورو نــا ڕوانگەیی پڕۆسەی ئاوێتەبوونی هێزی کۆمەلآیەتیدایە، چــونکە پێویــستی ســەرکردە لــەم کاتەدا ئەمە دەخوازێت، ئەگەر ئەو کەسە نەبێت ئــەوا یــەکێکی تــر شــوێنی دەگرێتــەوە، ئەگەر کەسێکی تەمەن بچووکیش ئەو ئەرکەی لە ئەستۆ گرت، لە ناکاو گەشــە دەکــات و توانای لە ئەستۆ گرتنی ئەو بەرپرسیاریەتییەی دەبێت .

٢- سەرکردایەتی پیرۆزەو خواپێدانە: سەرکردایەتیکردن لە لایــەن چــەند کەســێکی دیاریکراو، لە لایەن یەزدانەوە بــەم پلەیــە پاداشــت کــراون، بــە بــەهرەو ژیــری و حیکمەت و لێهاتوویی و هەموو بنــەماکانی ســەرکردایەتیکردن. هــەر وەك چــۆن دەربڕینی گشت هەڵوێستەکانی کۆمەلآیەتی پێویست نابنە هۆی دەرکــەوتنی هــەر

---

[172] بروانــە: ا.د.عمــر احمــد همــشری، التنــشئة الاجتماعيــة للطفــل، المــصدر الــسابق، ص ٢٧٢.

سەرکردەیەك، ئەگەر ڕەزامەندی یەزدانی لەگەڵدا نەبێت. ئەمەشی گەڕاندۆتەوە بۆ بیردۆزەکەی (کارلیك)[173].

**٥- ڕێکەوت:** لە زۆر بۆنە گشتییەکاندا، سەرکردایەتیکردنی لە ناکاو بە ڕێکەوت دەکەوێتە سەر شانی یەکێك. لە کات و ساتێکی دیاریکراو ئامادە بێت. سەرەڕای بەدی نەکردنی جیاکەرەوەی کەسایەتی و هەڵوێست نواندن و میراتگری لەم کەسەدا. تەنها فاکتەری ناکاوی ڕێکەوت و فاکتەری ئامادەبوون، بووەتە هۆی بە ڕۆڵی سەرکردایەتیکردن هەڵبستێت[174].

**٦- پایەی پێشووتر:** ئەگەر مرۆڤێك سەرکردایەتی گرووپ و کۆمەڵەکەی خۆی بەدەست هێنا، ئەو مرۆڤە سەرکردەیەو جێگای شانازی و سەرنجڕاکێشانی ئەندامانی گرووپەکەی بۆ خۆی ڕادەکێشێت. ئەمەش دەبێتە بەشێك و لە کەسایەتی تاکەکانی جیا ناکاتەوە و زیاتر هەلی بۆ دەڕەخسێنێت، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژدا سەرکردایەتی وەربگرێت و ببێتە سەرکردە . زۆرجاریش مرۆڤێك کە پلەی سەرکردایەتیکردنی بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و جێگای ڕەزامەندی گەل و گرووپەکەی لە ڕابردوو وەرگرتبێت، لە دواڕۆژیشدا لەوانەیە پایەی سەرکردایەتیکردن، لە بواری تریشدا بەدەست بهێنێت[175].

**٧- مەرجەکانی پێویست:** ئارەزوومەندی و ئارەزوو لە سەرکردایەتیکردن، بە بنەمایەکی سەرەکی دادەنرێت، چونکە هەندێك لە تاکەکان ئارەزوویان بە هێزترە، لە تاکەکانی تر، لە سەرکردایەتی وەرگرتن، لە کۆمەڵگا جۆراو جۆرەکاندا.

---

[173] د. عبدالحكيم عباس قشطة، الجماعات والقيادات، المصدر السابق، ص ٧٨.

[174] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٧٩.

[175] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٧٩.

ئارەزوومەنـدی جۆراوجـۆر هەیـە لـە خزمــەت و خزمــەتکاری و خزمــەتکردن و دەسەلاْت وەرگرتندا. هەربۆیەش دەبینین پیـاوان حـەزو ئارەزوویـان لـە دەسـەلاْت وەرگرتن، لە ئافرەتان زیاترە. ئەمەش بە ڕوونی و بەرزترو زیاتر، لە ڕێـژەی پایـەی سەرکردایەتیکردنی پیاوان لە ئافرەتان، لە جیهان دەردەکەوێت[١٧٦].

**٨- هێزی سزادان:** سزادان چ بە (ڕەخنە، سەرنج ڕاکێـشان، یـەکلایی کردنـەوەی ماددی، دەرکردن، گواستنەوە، لەسـەر کـار لابـردن) بێـت. ئەمانـە دەبنـە هـۆی دوورکەوتنــەوە لــە سەرپێــچیکردن بەرامبــەر بــە ســەرکردەکانیان، لــە ترســی سزادان[١٧٧].

**٩- دەسەلاْتداریەتی:** پێویستە دەســەلاْتداریەتی هێـزی کاریگـەری کۆمەلاْیـەتی هەبێت، وە دیاردەکانی ئەم دەسەلاْتداریەتییەش بریتین لە[١٧٨]:

١- **شەرعیەتی هێـز:** هێزی دەسەلاْتی ناوەندو لایەنگرانیش باوەڕیـان بـە هێـزی سەرکردەکانیانەوە هەیە . لەبەر ئەوەی ئەو ناوەندەی دەسەلاْتی وەرگرتـووە مـافی خۆیەتی، لەسەریان پەیڕەو بکات.

**٢- هێـزی سـزادان :** پێویـستە لایـەنگرانی سـەرکردە هەسـت بـە هێـزو توانـای سەرکردەکەیان لـە سـزاداندا بکـەن . سـزادانیش دلْخۆشـکەری نییـە، لایـەنگرانیش گوێڕایەڵی سەرکردەکانیان دەکەن لە ترسی سزادان. لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا لە سەنگەرەکانی شیشار دوژمن هێرشێکی گەورەی هێناو، بارودۆخی شەڕ بۆ بەرژەوەندی داگیرکەران گۆڕا، بەلاْم لە ناکاو هێزی پێشمەرگە گەیشت، بە سەرکردایەتی (د.خالید)

---

[١٧٦] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٨٠.

[١٧٧] د. عماد عبدالرحيم زغلول، علم النفس العسكري، المصدر السابق، ص٦٤.

[١٧٨] ا. د. عمر احمد همشري، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ٢٧٢.

شەڕ گەرم و خوێناوی بوو، لە ئەنجامدا دوژمن شکاو گشت شوێنە داگیرکراوەکان ئازاد کرانــەوە و دوژمــن زەرەرو زیــانێکی گــەورەی مــاڵی و گیــانی لێ کــەوت، زیــانی پێشمەرگەش تەنها یاریدەدەری سەرکردەی هێزەکە شەهید کرابوو[١٧٩]. هەر ئەمــەش بووە هۆی سزادانی دوژمن و وانەیەکی ترسناکیان پێدان.

**٣- هێزی پاداشت :** پێویستە هاووڵاتی و لایــەنگران هەست بــە هێــزو توانــای ســەرکردە بکــەن، لــە پاداشــت بەخــشین، پاداشــتیش دڵخۆشــکەرەو، هەنــدێك لەپێداویــستییەکان تێــر دەکــات. لایــەنگرانیش بــە باشــترین شــێوە بــە ئــەرك و کارەکانیان هەڵدەستن و گوێڕایــەڵی زیــاتری ســەرکردەکەیان دەکــەن، بەمەبەســتی بەدەستهێنانی پاداشت.

**٥- هێزی مەرجەعیەت و گەڕانەوە:** سەرکردە سەرنجی ئەندامان بــۆ لای خــۆی ڕادەکێشێت، دەبێتە نیــشانەی یــەك ڕیــزی و یــەك دەنگــی و یــەکگرتن لــە دوای سەرکردە دیاریکراوەکەیان .

## سێیەم: گۆڕینی شێوازی سەرکردایەتیکردن

دەتوانرێت گۆڕانکاری لە شێوازی سەرکردایەتیکردن بکرێت، بە ڕەچـاوکردنی ئــەو ڕێگایانەی خوارەوە[١٨٠]:

**یەکــەم :** مەشــق پێکــردن : گرنگــی گــەورە لــە ڕاهێنــان و مەشــق پێکردنــی سەرکردەکاندایە، بۆ ئەوەی ئەرك و کارو سەرپەرشــتییەکان، بــە پلانــدانان ئــەنجام

---

[١٧٩] خدر حاجی تەها، ڕانیە، ڕێکەوتی ٢٠٠٦/٨/١٤.

[١٨٠] بڕوانە: د. محمـود الـسيد ابوالنيـل، علـم الـنفس الاجتمـاعي، الجـزء الثـاني، الطبعـة الرابعة، مصر، ١٩٨٥، ص ٣٣٩، ص٣٤٠.

بـدەن. بـە ئامـادەکردنی بەرنامـەو پرۆگرامـی مەشـق پێکـردن لەسـەر بنـەمای دیاریکراو لەوانەش :

١- پـسپۆریەتی دیـاریکردن: پـسپۆڕیەتی پێویـست لـە گـشت ئاسـتەکانی سەرکردایەتی دیاری بکرێت، بە مەشقکردنیش بۆ گەیـشتن بـە ئاسـتی سـەرکردە. ئەمەش لە ڕێگای ڕووپێوی مەیدانی بۆ گرفتەکانی ڕووبـەڕووی گـرووپ و کۆمـەڵ دەبنەوە. ئەمەش ڕەنگدانـەوەی کـەمی پـسپۆڕیەتی سـەرکردەکان، لـە ئـەنجامی نەبوونی چارەسەری بۆ گرفتەکانیان دەردەخات.

٢- دیاریکردنی ئامێری پێویستی مەشق و گرنگی پێدانی : بە مەبەستی زانیـاری و پـسپۆڕیەتی پڕاکتیکـی و بینـراوی گەیاندنـە سـەرکردەکان، پێویـستە توانـای لێهاتووی لەم بوارانەدا هەبێت .

٣- بەردەوامی مەشق : پێویستە مەشق و ڕاهێنان بەردەوام بێـت، بـە کەرەسـتەو ئامێرو شێوازەکانی سەردەمییانە، بۆ دابینکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی شارەزایی سەرکردەکان .

٤- فێرکردنـی فـەرمی : فێرکردنـی فـەرمی ڕاسـتەوخۆ لەگـەڵ هێـزی کـارو پێویستییەکانی پیشەکان بگونجێت.

٥- پاداشتکردن : پاداشتی گونجاو بۆ بەسـتنەوەی پەیوەنـدیی سـەرکردەکانە، بـە ڕەفتاری سەرکەوتووانە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕەفتارەکانیان بەرەو باشی بەرز بکەنەوە .

**دووەم:** سەرچاوەکانی گەشەسەندنی ئاستی سەرکردە :

سەرچاوەکانی مەشق پێکردنی سەرکردەکان و گەشەسـەندنی ئاسـتە بـەرزەکان، چەندین سەرچاوە هەیە لەوانەش :

١- گەشەکردنی مەشق لەکاتی ئەنجامدانی فەرمانەکاندا ئـەویش لـە چوارچـێوەی کارکردن لە ڕێگای بەرنامەی پلاندانانی نێو دەزگاکاندا دەبێت.

٢- فێرکردن لە پەیمانگاکانی مەشقی تایبەتی لەدوای کارکردندا بێت.

٣- پەیمانگاکانی مەشق پێکردنی سەرکردەکان و کارگێڕو بەڕێوەبەرەکان .

پەیمانگاکانی مەشق پێکردنی سەرکردەکان لە گشت جیهاندا بلاَو بۆتەوە، بۆ ئامادەکردن و گەشەسەندنی شارەزایی و ڕەفتاری و هونەری سەرکردەکان، لەم پەیمانگایانەش قوتابخانەی کارگێڕی گشتی لە پاریس، لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزراوە .

**مەشق و ڕاهێنان لەسەرکردایەتیکردن :** ئەگەر ورد ببینەوە لە سیماتە جیاکەرەوەکانی کەسایەتی سەرکردایەتیکردن، هەموو خەسڵەت و جیاکەرەوە کەسایەتییەکانیان وەرگیراون، لە ڕووی ڕۆڵی کۆمەلاَیەتییەوە تەماشای بکەین لە چوارچێوەی پێوەرە کۆمەلاَیەتییەکان وەرگیراون . ئەمەش بەرپەرچدانەوەی وتە کۆنەکەیە (پەندێکی پێشینانە ) دەڵێت: سەرکردەکان لەدایك دەبن و دروست ناکرێن. پێویست بە مەشق و ڕاهێنانی سەرکردەکان نییە. بەلاَم ڕوانگەی تیۆرە نوێیەکانی سەرکردایەتیکردن، دەتوانرێت لە ڕێگەی فێرکردن و فێربوون سەرکردە دروست بکرێت .

لەبەر ئەوەی زیاتر سەرکردە دروست دەکرێت، لەوەی کە لە دایك دەبێت. بۆیەش پێویستە گرنگی بە مەشق و ڕاهێنان و دروستکردنی سەرکردە نوێیەکان بدرێت[١٨١]. مەشقکردن فرمانێکی گرنگە و هەلێکی ڕەخساوە بۆ بەکارهێنانی زۆرترین توانا سروشتییەکان، مەشق و راهێنان ئاراستەکردنە بە ئامانجی بەدەستهێنانی ڕوودانی فێرکردنی بەپەلە و ناکاو و ڕێکەوتی لێهاتوو، بۆ ئەوەی

---

[١٨١] صالح محمد علي ابوجادو، ، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، مصدر السابق، الطبعة الثالثة، ٢٠٠٢، ص ١٨٤.

ببێتە جێگیرکردنی سەقامگیریی کاریگەرو شارەزایی و پسپۆڕیەتی تاك بۆ سەرکردایەتیکردن. لە ئەنجامدانی چالاکی ڕاهێنان و مەشق پێکردنیدا.

**ڕیگاکانی مەشق پێکردن** : زانایان لەو باوەڕەدان کە سەرکردەکان زیاتر دروست دەبن، لەوانەی کە لەدایك دەبن. دوو ڕێگەش بۆ مەشق و ڕاهێنان لەسەر سەرکردایەتیکردن هەیە:

**١- ڕێگا فەرمییەکان:** ئەم ڕێگەیە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی مەشق و ڕاهێنان داڕێژراوە، لە لایەن کەسێکەوە مەشق و ڕاهێنان بە چەندین تاك بۆ سەرکردایەتیکردن، لەناو ڕێکخراوێکی دیاریکراودا دەکرێت. لە ئامێرو کەرەستەکانی (وانە و کۆڕو گەشتی گۆڕەپان و پڕاکتیکی و مەشق و ڕاهێنانی کۆمەڵی)دایە[١٨٢]. ڕێگا فەرمییەکانی مەشقکردن (Formal Training) لە باشترین ڕێگاکانیش ڕێگای وانە وتنەوەیە کە بە بلاْوترین ڕێگای چالاکی فێرکردن و مەشق و ڕاهێنانی کۆبوونەوە فراوانەکان دادەنرێت. فاکتەرێکی یارمەتیدەر لەسەر مەشق پێکردندا، گرووپ دروست کردنە، ئەویش بەمەبەستی ڕازیبوون لەسەر گۆڕانکاری و ئامادەبوون و توانای گەشەکردنی هەبێت[١٨٣].

**٢- ڕێگا نافەرمییەکانی مەشق پێکردن:** ( In Formal Training) یەکێك لە پێویستییە سەرەکییەکانی سەرکردایەتی ڕاهێنان و مەشق پێکردن، بریتییە لە فێرکردنی سەرکردە و چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن و تێگەیشتن لە خەڵکی تردا. بە ڕێگەی تێبینی کردنی کەسایەتی و بابەتەکانی پەیوەندیدار بە ڕەفتارەکانی مرۆڤ. لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەرکردایەتیکردندا. ئەو

---

[١٨٢] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٣٨.

[١٨٣] صالح محمد على ابوجادو، سيكولوجية التنشئة الاجتماعية، مصدر السابق، ط٣، ٢٠٠٢، ص١٨٤.

ڕێگایانەی کە تاکەکەس خۆی پەنای بۆ دەبات، بۆ گەشەکردن و پێگەیاندنی هێـزو تواناو شارەزایی لە سەرکردایەتیکردن ئەویش ئامێرو کەرەستەکانی (تێبینی کردن، خوێندنەوە، گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردەکانی تـردا کـردن، بینینـی چـەند ڕەفتـارێکی سەرکردەکان لە هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانیاندا ) لە چـەندین ولاتـی جۆراوجـۆر لـە ڕێگەی وێنەی فیلمی سینەمایی و ڤیدیۆییدا پەیڕەو دەکرێت[١٨٤]. هەر بۆ زانیاری زیاتر زۆر لە سەرکردەکانیش پەرتووکە نووسـراوەکەی میکاڤیللییـان خوێندۆتـەوە لەژێر سەرینەکەیاندا بووە لەوانەش (ناپلیۆن و ستالین ...هتد).

٣- چەندین ڕێگاو شێوازی فەرمان وەرگرتن و شارەزاییبوون لە سەرکردایەتیکردندا هەن لەوانەش[١٨٥]:

١- ئاڵوگۆڕی بیروبۆچوون لە نێوان مەشقکەر و مەشق پێکەردا .

٢- مەشق و ڕاهێنان لە کەش و هەوایەکی دیموکراتیەتیدا پەیڕەو بکرێت .

٣- مەشق پێکەر شارەزایی تەواوی زانستی و لێهاتوویی و ئامادەیی باشی مەشق پێکردنی پێ هەبێت .

٤- خوێندنەوەو لێکۆڵینـەوە، لـە ڕەفتـاری کۆمەلایـەتی و هانـدەرەکانی تـاك و گرووپەکان، لە ڕێگەی دەروونناسی کۆمەلایەتییەوە بکۆڵدرێتەوە و ئەنجام بدرێت.

٥- ئەرك و بەرپرسیاریەتی بەو کەسانەی مافی وەرگرتنی بەرپرسیاریەتییان هەیە بدرێتێ .

٦- ئاسانکاریکردن بۆڕاهێنەر لەو مەشـق و بەرنامانـەی ئـارەزووی هەڵبـژاردن و مەشق پێکردنی هەیە.

٧- مەشق پێکەر بە ورە بەرزییەوە، ئامادەی دانانی بەرنامەکانی مەشق پێکردن بێت .

---

[١٨٤] د. ابراهيم ياسين الخطيب وآخرون، التنشئة الاجتماعية للطفل، المصدر السابق، ص ١٣٨.

[١٨٥] هەمان سەرچاوە، ل ١٣٨.

## ئه نجامی دەستکەوتوو

سەرکەوتن یان شکستهێنانی هەر ڕێکخراوێك، گرووپێك، دەزگایەك، لەسەر سروشتی سەرکردایەتی و جۆری سەرکردایەتییە پەیڕەوکراوەکە بەندە .

لە سەرکردایەتیکردنی دیموکراتییەتدا دیاردەی ناڕازی ئەندامان زۆر کەمترە لە سەرکردەکانیان.

لە سەرکردایەتیکردنی سەپاو و زۆردارەکیدا، هەستی هەڵگەڕانەوە ڕوون و ئاشکرایە و زوو بە دەر دەکەوێت و دیاری دەکات .

لە سەرکردایەتی ئازادانەی خۆ بەڕێوەبردندا پێویستی گرووپ لە گرنگیدانیان بە بوونی سەرکردەو ڕۆڵی سەرکردە ڕوون و ئاشکرایە.

لە بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی دەوڵەتیدا لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی ڕامیاری و دامەزراندنی بەرپرس و سەرکردەکانی لە هەرێمی کوردستاندا.

ئەندامانی سەرکردایەتی دیموکراتی زیاتر گرنگی بە کارەکانیان دەدەن و دوژمنکارانە نین و یەکگرتوون لەناو خۆیاندا زیاتریش حەز و ئارەزوویان لە دروستبووندایە.

ئەندامانی سەرکردایەتی زۆردارەکی سەپاو بە بێزەوە تەماشای سەرکردەکانیان دەکەن و هەوڵی لەناوبردنیان دەدەن.

سیستەمی لێهاتوویی دیاریکەرو کاکڵەی دابینکردنی ڕەگەزە باشەکانە، بۆ گرتنەدەستی ئەرکە قورسەکانی کارگێڕی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتیدا.

یەکێك لە نیشانە تایبەتمەندەکانی سەرکردایەتیکردن بە کردەوە و کارکردنە، نەك بە قسەکردن.

١٠ـ سەرکردە لە هەڵسوکەوت کردندا دادپەروەرو یەکسانی بێت، لە خۆڕاگریشدا بە هێز بێت.

١١ـ وەرگرتنی بڕیاری گونجاو لە کات و ساتی گونجاودا، بێ دوودڵی و ساردی نواندن.

## ڕاسپاردەکردن

مرۆڤی خاوەن بیروباوەڕو هوشیارو ڕۆشنبیرو زیرەکی کورد، زۆر ئاسان نییە، کـاری تیّ بکریّت لە هەڵبژاردنی سـەرکردە و هاوپەیمانەتیـدا، بـۆ ئـەوەی متمانـەی پـیّ بکریّت و لە لایەن کۆمەڵگای کوردستانییەوە پشتگیری لیّ بکریّـت. پیّویـستە زۆر بە وریایی بۆ بەرژەوەندی کورد و کوردستان کارەکانی ئەنجام بدات.

پیّویستە سەرکردەکانی کورد بڕواو متمانەی تەواو بە سـەرکردەکانی داگیرکـەرانی کوردستان نەکەن.

سەرکردەکانی کورد بە هیچ شـیّوەیەك بۆیـان نییـە هیّـزو سـەرکردە ناکۆکـەکانی داگیرکەرەکانی کوردستان ئاشت بکەنەوە. چونکە لە دوارۆژدا دەبنەوە دڕك لە سەر ڕیّگای کوردو سەرکردە نیشتمانپەروەرەکانی کوردستان.

سەرکردە سیاسییەکانی کورد نویّنەرانی کۆمەڵگای کوردستانین، پیّویستە لەسەر بەرژەوەندی هاوبەش لەگەڵ سەرکردەکانی وڵاتان و دەوروبەر کار و ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن.

پیّویستە بە هەموو شیّوەیەك هەوڵ بدریّت متمانە بە بیّگانە نەکریّت، تەنها لەسەر بنچینەی بەرژوەندی هاوبەش نەبیّت.

سەرکردایەتی کورد تەنها کۆمەڵگای هۆشیار و خاك و چیاکانی کوردستان پشت و پەنایەتی.

پشت بە عەرەبی نەتەوەخواز و خۆپەرست نەبەستن و متمانە نەبوون پیّیان نیشانەی سەرکەوتنە.

بە هیچ شیّوەیەك متمانەو بڕوا بە وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان نەکریّت.

کورد بە یەکگرتن و یەك ڕیزی و تەبایی مافەکانی خۆی دابین دەکات.

## الخلاصــة

**م. م. أسماعيل محمد خضر شكاك**

القيادة ودورها في ادارة مؤسسات الدولـة، لهـا اهميتهـا وخـصوصيتها اذا نظرنا الى تاريخ الشعوب على وجه الارض تبدو لنا بصورة جلية وواضـحة، ان الشعوب والدول في هذا المجال قد ادوا ادوارهم بـشكل مـنظم وفقـا لنظـامهم الثقافي الاجتماعي التقدمي المتألق في مجالات مختلفة سياسية وعـسكرية واداريـة قد احرزوا فيها النصر.

ولالقاء الضوء على اهمية المجال العسكري ودور القيادة في ادارة الدولـة، بدأنا بهذا البحث الذي يبحث عن اهمية القيادة ولتعريف مجالاتها ومستوياتها (مستويات القيادة). وانواع القيادة ومهامها مع سمـات وخـصائص القيـادات وعناصر القيادة ومنابع (مصادر) قوتها، كما القي الضوء علـى كيفيـة تنفيـذ وتغير انواع القيادة، بحـسب الظـروف الملائمـة للحيـاة الاجتماعيـة والدينيـة وادارة مؤسسات الدولة، لينتفع منها في الحياة الادارية، ولاجـل ذلـك القينـا الضوء على هذا الموضوع واتباع نقاطه الهامة لان النـصر في هـذا الميـدان لـه خصوصيته واهميته، آملين ان تنتفع منها المؤسسات الحكومية في ادارة اقلـيم كوردستان / العراق.

## Abstract

*Ismail M. Kh. Shekak (M.A)*

The leadership and its role in running the state establishments has its significance. If we have a look at the history of nations we realize clearly that these nations and states played their roles systematically according to their advanced social cultures in different fields of politics, military, and administration and they succeeded in all the mentioned fields.

For shedding light on the importance of the military field and the role of the leadership, the study attempts to focus on the importance of the leadership and define its fields and levels. The study also shades light on the ways of carrying out and changing type of leadership according to the conditions of social, religious and running the states. In order to be useful for administration, the study deals with this subject that the Kurdistan Region Government establishments will benefit from it.

# تایبەتمەندییێن زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی

## (کتێبێن رەخنەیی وەکو نموونە)

## ٢٠٠٦-١٩٧٣

**( ئەڤ ڤەکۆلینە هاتییە وەرگرتن ( مستل) ژ نامەیا ماستەرێ یا بناڤێ (زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی، کتێبێن رەخنەیی وەکو نموونە، ١٩٧٣-٢٠٠٦) کۆلیژا ئادابێ زانکۆیا دهوکێ**

**د. فوئاد رەشید محەمەد**
کۆلیژا پەروەردا بنیات
پشکا زمانێ کوردی
زانکۆیا سەلاحەدین

**نەفیسا ئیسماعیل حاجی**
کۆلیژا ئادابێ
پشکا زمانێ کوردی
زانکۆیا دهوک

**کورتییا ڤەکۆلینێ:**

ئەڤ ڤەکۆلینە هەولدانەکە بۆ شیکرنا زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی د ماوەیێ د ناڤبەرا (١٩٧٣ــ ٢٠٠٦)دا و پێشچاڤکرنا گرنگترین تایبەتمەندییێن وی، خویاکرنا وێ نووخوازییا د زمانێ رەخنەیێدا پەیدا دبت ژ ئەنجامێ لادانا سنۆران د ناڤبەرا زمانێ دەقا ئەدەبی و رەخنەیێدا، بۆ ڤێ چەندێ مفا ژ تیۆرا گەهاندنێ یا (رۆمان یاکوبسن)ی هاتییە دیتن. ئەڤ چەندە د کتێبێن رەخنەییدا ئەوێن ڤەکۆلینێن رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی ل کوردستانا عیراقێ د وی ماوەیێ دیارکریدا ب خوەڤە دگرن، ب رەنگەکێ بابەتی هاتییە ئەنجامدان.

**پێشگۆتن:**

هەردەم دەقێ ئەدەبی جهێ سەرنجا ڤەکۆلەر و رەخنەگرانە، لەورا بیاڤێ رەخنەیێ هێژتا یێ خامە و پێدڤی ڤەکۆلینێیە، هەرچەندە ژ هندەك ئالییانڤە ڤەکۆلین تێدا هاتینە ئەنجامدان. ئەگەر رەخنە ب گشتی هێژتا بیاڤەکێ خام بت ، زمانێ وێ هەر یەکجار ب رەنگەکێ زانستی ڤەکۆلین تێدا نەهاتییە کرن. ژ بەر ئەرکێن رەخنەیێ یێن گرنگ وەکو ناڤەندەك د ناڤبەرا دەقی و خواندەڤانیدا، کو ب رێیا زمانی دهێنە ئەنجامدان، لەورا مە ب فەر زانی، زمانێ رەخنەیێ بکەین بیاڤێ ڤەکۆلینا خوە، ئەگەرەکێ دی ژ بلی مەرەما مە بۆ چارەکرنا وان ئالییێن مە ئاماژە پێ کری ئەوە کو لنك هندەك رەخنەگران سنۆر د ناڤبەرا دەقێ ئەدەبی و یێ رەخنەیێدا دهێنە لادان و رەخنە بەر ب دەق بوونێ دچیت و زمانێ ئەدەبی جهێ خوە تێدا دبینت، ژبەر هندێ مە ڤیا بزانین رەخنەیا کوردی د ڤی بیاڤیدا چەوا هەڵسوکەوتێ دکەت، پێدڤییە رەخنەگرێ کورد ژ ئالییێ ب جهئینانا ئەرکێن زمانی د زمانێ خوەدا ل چ سنۆر ڕاوەستیت.

بابەت ژ چەند ئالییانڤە هاتییە سنۆردارکرن، ئەوژی مە زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەری وەرگرتییە، چونکی ب ڕاستی ڤەکۆلین د بیاڤێ رەخنەیا چیرۆکێدا ل دووڤ زانینا مە ل ئاستەکێ کێم دایە، نەمازە د بیاڤێ ئەکادیمیدا، دیسان ژ بەر ڤیانا مە بۆ ڤێ ژانرا ئەدەبی کو مە زانی دێ پتر مە شیان تێدا هەبن. دیسان ب تنێ کتێبێن ڤەکۆلینێن رەخنەیی هاتینە وەرگرتن، چونکی ب ڕاستی پشتی لێگەریان و ڤەکۆلینا مە ل ڤی بەرهەمی، بۆ مە خویا بوو کو پتریا وی بەرهەمێ پێشوەخت ل سەر بەرپەرێن رۆژنامە و کۆڤاران هاتینە بەلاڤکرن، د کتێباندا خرڤەبووینە، دیسان ئەڤ کتێبە ڤەکۆلینێن درێژ و ئەکادیمی ژی ب خوەڤە دگرن، ئانکو بەرهەمەکێ هەمەجۆرە، مە دیت دێ پتر خزمەتا بابەتی کەت، نەمازە کو مەرەما

ڤـەکۆلینێ سـیما و تایبەتمەنـدییێن زمانینــە، نـەك ئـالییێ مێژوییـیـە. ب تنـێ ڤەکۆلینێن پراکتیکی هاتینە وەرگرتن چونکی مەرەم و ئارمانجا ڤـەکۆلینێ تێدا بەرجەستە دبت. ژ ئالییێ ماوەی ژیڤە، ژ سالا (١٩٧٣) وەکو دەسـتپێك هاتییـە وەرگرتن، چونکی یەکەم بەرهەمێ هنـدەك سـیماییێن رەخنـەیی هـەلگرتی د ڤـێ سالێدا چاپ بوویە. هەتا سالا (٢٠٠٦) چـونکی دەمـێ چەسـپاندنا بابـەتێ مـە بوویە، هەرچەندە ماوەیەکێ درێژە بەلێ پتر د خزمەتا بابەتی دایە، چونکی دیـارە رەخنەیا کوردی ل دەستپێکێ بۆ ماوەیەکێ باش هەمان سیما ب خوەڤـە گرتینـە، هەروەها ب تنێ ئەو کتێبێن رەخنەیی یـێن ب زمـانێ کـوردی و ل سـەر دەقـێن کوردی و ئەوێن ل سنۆرێ هەرێما کوردستانا عیراقێ چاپ بووین دکەڤنە د سنۆرێ ڤەکۆلینا مەدا.

ژ ئالییێ رێبازا ڤەکۆلین پێ هاتییە ئەنجامدان، چونکی ئەڤ ڤەکۆلینە د کەڤتـە د وارێ رەخنەیا رەخنەییێدا، ئانکو ڤەکۆلین نە ل دەقـێ ئەدەبییـە، بـەلکو ل سـەر ڤەکۆلینێن رەخنەییە، لەورا مە خوە ب چـو رێبـازێن رەخنەییڤـە گـرێ نەدایـە، بەلکو مفا ل دوڤ پێدڤیاتییا بابەتی ژ پتر ژ رێك و میتۆدەکێ هاتییە دیـتن، وەکـو شیکاری، شێوازگەرییا ئەژمارکاری ... هتد.

ڤـــەکۆلینێ ژ دوو تـــەوەران پێکـــدهێت ئـــەوژی: رەخنـــە ژ ئـــالییێ زمانیڤـــە، تایبەتمەندییێن زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی، کو تێدا هـەردوو ئـالیییێن ڤەکۆلینا رەخنەیی،( ناڤونیشان و کـار) هاتینـە پێشـچاڤکرن و ل دووڤ سـیماییێن ئەرکێن زمانی ئەوێن یاکوبسونی خویا کرین، ئانکو ناڤونیـشان ل دوڤ زمـانێ وان هاتینە شلوڤەکرن و پۆلینکرن، هەروەها کارێ رەخنەیی ژی ژ ئـالییێ گرنگیـدان ب رەگەزێن پەیامهنێر، پەیام، پەیام وەرگـر و د ئەنجامـدا ب جهئینانـا ئـەرکێن زمانی هاتییە ڤەکۆلین.

**یەکەم: رەخنە ژ ئالییێ زمانیڤە**

ئاشکرایە ئالاڤێ دەربڕینێ د رەخنەییێدا ژی وەکو گەلەك شێوەییێن دی یێن پەیوەندیکرنێ زمانە، لەورا بۆ رۆنکرنا دیاردەیا زمانی تێدا" دبت ژ دەرازینکا ئەرکێن زمانی دەستپێبکەین"[١]. رەخنەگرێ ئنگلیز (ریچاردز ١٨٩٣) دوو ئەرکان دیار دکەت ، ئەوژی: هێمایی و هەلچونینە، دبت زمان وەکو هێما ب جە بهێت، ئەوژی د ب کارئینانا زانستییا زمانیدا، یان ب مەرەما وی هەلویست و ئازراندنا ل دوڤرا، وەکو ب کارئینانا هەلچونییا زمانی[٢]. دەمێ ئەم ڤێ چەندێ ل گەل ئاخڤتنا (رولان بارت)ی ل دۆر رەخنەییێ هەڤبەر بکەین، دەمێ رەخنەییێ ژ ئەدەبی جودا دکەت کو" سەرەدەرییا وی نە وەکو ئەدەبی ل گەل جیهانێیە، بەلکو ل گەل دارژتنەکا زمانڤانییە...، رەخنە زمانەکێ دوویێە یان میتا زمانە (Meta language)[*]... ل سەر زمانێ یەکێ یان زمان وەکو بابەت. ب ڤێ چەندێ دڤیا کریارا رەخنەییێ دوو جۆرێن پەیوەندییان ل بەرچاڤ وەرگرت، ئەو ژی پەیوەندییا د ناڤبەرا زمانێ رەخنەییێ و زمانێ دانەرێ بابەتێ رەخنە ل دۆر، پەیوەندییا زمانێ دانەری و جیهانێ، تێکەلییا ڤان هەردوو زمانان د رەخنەییێدا ئەوە وێ نێزیکی لۆژیکێ دکەت"[٣]،چونکی رەخنە ل دۆر دەقەکێیە و مەرەما وێ شلوڤەکرن و روَنکرنا وییە، لەورا پێدڤییە ل ڤێرێ ب زمانەکێ راستەوخۆ و زانستی بهێتە نڤیسین، ژ ڤێ چەندێ ئەم دشێین بێژین"رەخنە پەیوەندییا زمانی ب زمانیڤەیە، بەلێ ئەگەر ل ڤی ئاستی راوەستیا، دێ ئەرکێ وێ سنۆردار بت، دبیت ل گەل دەقێن رێزمانکی و دەقێن زانایێن فیلۆلۆگی و واتاسازیێ و مۆرفۆلۆژی تێکەل ببت. بەلکو پێدڤییە ژ ڤێ پەیوەندیێ دەربازی یا دی ببت....ئەوژی پەیوەندییا زمانی ب جیهانێڤەیە"[٤] ، ئانکو ئەم دگەهینە هندێ

کـو دەقــێ رەخنــەیی زمــانی ژ هــەر دوو ئالییانڤــە پــەیرەو دکــەت ، رۆنکــرن و شلوڤەکرنێ، دیسان وەکو ئازراندن و جوانکاری.

دەمێ ئەم باسێ ئەرکێن زمانی دکـەین، گومـان تێـدا نینـە نەخـشەیێ (رۆمـان یاکوبسون)[٥]ی ئەڤێ ل خوارێ ل بەر چاڤە:

ئەرکێ لێڤەگەر

ئەرکێ هەلچوونێ ------ ئەرکێ شعرییەت ------- ئەرکێ تێگەهاندنێ

ئەرکێ ئاگەهدارکرنێ

ئەرکێ میتا زمان (کارتێکرنێ)

کو زمان ل دوڤ زالبوونـا یـەك ژ وان ئـەرکان، نەخاسمـە ئـەرکێن (تێگەهانـدنێ، هەلچوونێ، شعرییەتێ) دهێتە پۆلینکرن، ژ سرۆشتێ رەخنەیێ دیار دبت کو"هـەر سێ ئـەرك وەکـو یـەك د گۆتـارا رەخنەییـدا پـەیرەو دبـن، چـونکی رەخنـەگر ژ هەلوێستەکێ جوانکاری دەست پێ دکەت، کـو هەلـچونە ب دەقـەکێ ئافرانـدییێ دیار کری، ژ بەر ڤـێ چـەندێ، دێ خـوە ل هنـدێ کەتـە خـودان کـو دەربڕینــێ ژ داخباربوونا خوەیا کەسایەتی بەرامبەر دەقی بکەت ، هەلچوونا رەخنەگری خـوڕی جوانکارییە، زێدەکرنا بـارکرییێ شـعرییێ دەقــی ب خـوە ڤـە دگـرت، دئەنجامـدا بەرهەمئینانا واتاییێ ب کریارەکا هەڤتـەریب ل گـەل وزەیـا ئافرانـدی ب خـوە، ل ڤێرێ ئەرکێ شـعرییەتێ پەیـدا دبـت، دەمــێ رەخنــەگر مــژوولی دەربڕینــێ ژ وێ هەلچوونا جوانکارییا دەق دئازرینت، دبـت"[٦]. ڕاسـتە د رەخنەیێـدا وەکـو هـەر کریارەکا پەیوەندیکرنێ، ئەرکێن زمانی دهێنە پێش، بەلێ دبت هـەر وەکـو دەقـا ئەدەبی، د دەقا رەخنەییدا ژی یەك ژ وان زال و خودان دەستهەلات بت.

د ڤی بواریدا ئەم دشێین ئاماژێ بکەین بۆچوونا (د. عەبدولـسەلام ئەلمـسەددی) دەمێ باسێ نوخوازییێ د دارژتنا رەخنەیێـدا دکـەت، کـو گۆپیتکـا نوخـوازیێ د

دارژتنێدا د شیانا ئافراندنا ئەرکەکێ نویــە د زمانیــدا ئــەو ژی میتــا داهێنــان و مــەودایێ وێ ئەدەبییــەتا گۆتــارا رەخنەییــە [٧]. بۆچــۆنێن ل دۆر ب کارئینانــا رەخنەیێ بۆ زمانەکێ ئەدەبی ل جهێ زمانێ زانستی جهێ خوە کرینە. بێ گومــان ڤێ چەندێ ئارێشە و لاوازییێن خوە هەنە، چونکی"دەمێ ئەرکێ شعرییەتێ زالّ بت ، دێ رەخنەگر ب زمانــەکێ شــعرییێ ل خــوە ڤەدگەرتەڤــە ب کارئینــت، ب ڤــێ چەندێ جیهانەکا تایبەت بۆ خوە دور ژ دەقێ ئارمــانج ئاڤــا دکــەت"[٨]. دیــسان بۆچوونێن دی ژی هەنە ئەوێن ب دیتنا وان پێدڤییە زمانێ رەخنەیێ زانستی بــت" شکاندنا سنوّرێن ڤەبر د ناڤبەرا بازنێ رەخنەیێ و ئەدەبیدا هەڵەیــە، ل ژێــر نــاڤێ هندێ کو ئارمانجا رەخنەیێ دارژتن و سالوّخدانە، نــەکو راڤەکرنــە"[٩]. د ناڤبــەرا ڤان بۆچوونێن جودادا، دبت هەڤسەنگییا رەخنەیێ د ناڤبەرا هونــەری و زانــستیدا ئەوا ب رێکا هەڤسەنگییا ئەرکان د زمانێ وێدا دابین دبت پتر گونجای بت، چونکی زاڵبوونا هەر ئەرکەکی، سرۆشتێ رەخنەیێ تێك ددەت، هەر چەوا بت دەمێ رەخنە ب زمانێ ئەدەبی بهێتە دارژتن، دێ دووبارە پێدڤی شروڤەکرنێیە.

**دووەم: تایبەتمەندییێن زمان رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی:**

ئەگەر ب گشتی باسێ رەخنەیا کــوردی بکــەین، نــەمازە ژ ئــالییێ زمــانی و سیماییێن وێڤە، دێ بینین رەخنەگرێ کورد ( بەختیار سەجادی) دەربارەی ســیما و زمانێ رەخنەیا سوننەتی کوردی دبێژت:" رەخنەیەکی زەینییە و ئاوێتەی هەســتی تاکە کەسی و ئانۆساتی نووسەر دەبێ رواڵەتێکی گێرانەوەیی لــە خــۆ دەگــرێ کــە لەوانەشە جار بە جار لــە پەنــدی پێــشینیان و قــسەی نەســتەق کــەلك وەربگــرێ. رەخنەی سوننەتی کوردی تەنانەت لە زۆر شوێنیدا زمانێکی ئەدەبی بەکار دەهێنێ

بیرۆکەی سەربەخۆی رەخنە لـە ئـەدەبی لا گەلالـە نـەبووە"[١٠]، هـەروەها ل دۆر رەخنەیا مۆدێرن دبێژت:" زمانێکی سادە و بە بـێ هونـەرە دەسـتکردەکان بـەکار دەبرێ چونکە لێرەدا زمانی رەخنـە وەکـو زمـانی زانـست دانـراوە. لـە رەخنـەی مۆدێرنی بە تایبەتی لە رەخنەی گشتی و تایبەتیدا، زمانێکی بابەتییانە زالـە کـە دەستەواژە زەینییەکانی تێدا نییە"[١١]. ئەگەر ل دوڤ ئـەرکێن زمـانی ل بۆچـوونا بەختیار سەجادی بنێڕین ل دوڤ وان سیماییێن وی خویا کرین کو رەخنەیا سـوننەتی یا کوردی د ناڤبـەرا ب جهێینانـا ئـەرکێ هەلـچوونێ و شـعرییە تێدایـە، بـەلێ رەخنەیا مۆدێرنا کوردی ئەڤان ئەرکان جهێ خوە تێدا نەمایە، چـونکی زمانـەکێ زانستی و بابەتی ب سەردا زالە و ب ڤـێ چـەندێ دیـارە پـتر ئـەرکێ لێڤەگـەر و تێگەهاندنێ پەیڕەو کرییە. ئەگەر ل دوڤ دیتنا  وی ئەڤە سیماییێن رەخنەیا کـوردی بن، ئەرێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی هەمان سیمایان ب خوەڤە دگـرت یـان خودان سیما و زمانێ خوەیێ تایبەتە؟

ڕەخنە کریارەکـا پەیوەنـدی پێککرنێیـە، پـەیامهنێر پـەیامێ بـۆ پـەیاموەرگری دهنێرت وەکو د ڤێ هێلکارییێدا خویا دبت:




ئانکو پەیام — کارێ رەخنەیی- ژ دوو پشکان پێکدهێت، ئـەو ژی: ناڤونیـشان، دەق، لەورا پێدڤییە ل زمانێ هەردووکا ب ڤەکۆلین و تایبەتمەندییا وان خویا بکەین.

**یەکەم : ناڤونیشان ژ ئالییێ زمانیڤە:** ڤەکۆلینێن رەخنەیی بێ ناڤونیشان پێشچاڤ ناکەڤن، د ڤی بیاڤیدا (ژان کۆهن) دوویات دکەت "کو هەر گوتارەکا پەخشانکی، زانستی یان ئەدەبی بت پێدڤی ب هلگرتنا ناڤونیشانی هەیە"[١٢]، ب ڤێ چەندێ گرنگییا ناڤونیشانی بۆ پەخشانێ بۆ مە خویا دبت ،" ئانکو ناڤونیشانکرن ژ ساخلەتێن دەقێ پەخشانکییە، ژ چ جۆر بت، چونکی پەخشان ل سەر گەهاندن و ریساییێن لۆژیکی دهێتە دانان"[١٣] . بۆ زانینا چەمکێ ناڤونیشانێ، پێدڤییە ئەم پێناسا وی خویا بکەین، دانەرێ زانستێ ناڤونیشانی(Titrologie) ڤەکولەرێ رۆژئاڤایی (لیو هویك) ب ڤی رەنگی پێناسە دکەت: "کۆمەکا گرۆڤێن زمانڤانینە. . . دشێت ل دەستپێکا دەقی بهێتەچەسپاندن ژ بۆنا دەستنیشانکرنا وی و ئاماژەکرن بۆ تامییا ناڤەرۆکا وی و پێخەمەت سەرنجراکێشانا جەماوەرێ مەبەست"[١٤]، ئەڤ پێناسە ئاماژە دکەتە هندێ کو ناڤونیشان رێیەکە بۆ ڤەکرنا گرێکێن دەقی، دیسان چەند ئەرکێن وێ خویا دکەت. نڤیسەر ب ناڤونیشانی گەلەك مەرەمان ب جە دئینت، چونکی ناڤونیشان ژی پەیامە و ئامرازێ وێ زمانە، لەورا " ڤەکۆلەر هەنە بۆ شیکرنا ناڤونیشانی بەر ب مفاوەرگرتن ژ ئەرکێن زمانی ئەوێن (رۆمان یاکوبسون)ی دیار کرین دچن. . . ، دیار دبت کو ناڤونیشانی ئەرکێ هەلچوونێ و لێڤەگەرینێ و ئاگەهدارکرنێ و جوانکارییێ و میتازمانڤانی هەنە"[١٥]، وەکو پێشتر دڤەکۆلینێدا دیار بووی کو هەر کریارەکا پەیوەندی پێککرنێ د زمانیدا ئەڤ ئەرکە هەنە، بەلێ یا گرنگ ئەوە، یەك ژ وان زالە، ئانکو ناڤونیشان هەموو ب یەك شێوە نینن، بەلکو د هەمەجۆرن.

بێگومان ناڤونیشان د وارێ ڤەکۆلینێن رەخنەییدا د هەمەجۆرن "سەرهندێرا کو ( ناڤونیشانێ هونەری ) د ڤەکۆلینێن نوو یێن رەخنەییدا بەربەلاڤە، لێ بیاڤێ

ب كارئينانا وی سنۆردایه و د چارچۆڤەكێ بەرتەنگدایە "[١٦] ، ژ ڤێ یەكێ خویا دبت كو ناڤونیشانێ نە هونەری، بێ ب زمانێ راستەوخۆ دەربڕینێ ژ ناڤەرۆكا ڤەكۆلینێ دكەت پتر بەربەلاڤە.

د ڤی بیاڤیدا ناڤونیشانێن كتێبێن رەخنەیا چیرۆكا هونەرییا كوردی ب گشتی ل سەر دوو جۆران پارڤە دبن، ئەو ژی:

**١- ناڤونیشانێن ب زمانەكێ ڕاستەوخۆ هاتینە نڤیسین:**

١-١- ناڤونیشانێن ب زمانەكێ راستەوخۆ و بابەتی هاتینە نڤێسین، كو خودان واتایەكا ڕۆن و ئاشكەرا یا دەستنیشانكرینە، دەمێ چاڤێ خوەندەڤانی ڤێ دكەڤت یەكسەر ناڤەرۆك و بابەتێن كتێب ب خوەڤە دگرت خوە ل هزرا وی ددەن. ب راستی دارژتنا ڤان ناڤونیشانان هەموو ل یەك ئاست نینن، ئانكو هندەك گەلەك رۆن و ئاشكەرانە، وەكو ( ئافرەت لە چیرۆكی كوردیدا ١٩٢٥- ١٩٧٠)، (بینای هونەری چیرۆكی كوردی لە سەرەتاوە تا كۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی)، (كاریگەری بیری نەتەوەیی لە گەشەسەندنی كورتە چیرۆكی كوردی كوردستانی عێراقدا ١٩٦١-١٩٧٠)، (بینای هونەری لەكورتە چیرۆكی كوردیدا ١٩٧٠-١٩٨٠)،( تەكنیكی گێڕانەوە لە چیرۆكەكانی مارف بەرزنجی دا)،( تەكنیكا ڤەگێرانێ د كورتە چیرۆكێن فازل عومەری دا)،( شێواز لە كورتە چیرۆكی كوردیدا)،( چیرۆكی هونەری كوردی ١٩٢٥-١٩٦٠). وەكو دیار ئەڤ ناڤونیشانە ژ ئالییێ رۆنی و راستەوخۆییڤە، دیسان دارژتنا رێزمانی ژیڤە گەلەك نێزیكی یەكن، كو ژ گرێیێن ناڤی پێكدهێن، ئاماژەیەكا راستەوخۆ بۆ بابەت و قۆناغا ڤەكۆلێن ب خوەڤە دگرت، دكەن.

١-٢- هندەك ناڤونیشانێن دی، ل گەل هندێ كو زمان راستەوخۆیە، بەلێ ئاماژەیەكا گشتییە بۆ ناڤەرۆكا كتێبێ، ئەو سنۆربەندییا د یێن دەستپێكێدا

دبينين، ل ڤێرێ پێشچاڤ ناكەڤن، وەكو ( لێكۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆكی كوردی١٩٢٥-١٩٦٩)، (چیرۆكی نوێی كوردی)، ( چیرۆكی هونەریی كوردیی شێوە و، شێواز و، بونیاد)، ( هزر و شێواز لە چیرۆكی كوردیدا)، ( چەند گوتارەكێد رەخنەیی)، (گۆتارێن رەخنەیی). وەكو دیار ئەڤ ناڤونیشانە ئاماژەیێن گشتینە بۆ بابەتی، نەمازە هندەك ژ وان بۆ كتێبەكێ هاتینە دانان كو د ناڤ خوەدا چەند ڤەكۆلین و گۆتارێن رەخنەیی یێن هەمەجۆر ب خوەڤە دگرت، چونكی كۆمكرنا بابەتێ وان هەمووان د ناڤونیشانەكیدا ب شێوەیێ وییێ زمانییێ هەژار گەلەك ب زەحمەتە، لەورا دبت رەخنەگری ناڤونیشان ب ڤی شێوەیێ گشتی دارژتبت.

١-٣- هندەك ناڤونیشانێن دی، دارژتنا وان یا رێزمانكی شێلییاتییێ ل نك خوەندەڤانی پەیدا دكەت، وەكو:

ناڤونیشانێ ( پێشوازی خاوەن شكۆ و دوو چیرۆك نووس) ژ ئالییێ پێكهاتا رێزمانیڤە، ژ لێكدانا دو گرێیێن ناڤی پێكدهێت، ئانكو ئاماژەیە بۆ دوو بابەتان، ئەوژی ( پێشوازی خاوەن شكۆ)، (دوو چیرۆك نووس) واتایا گرێیا دووێ رۆنە، لێ یا یەكێ، دەمێ چاڤێ خوەندەڤانی ڤێ دكەڤت، هزر ناكەت بابەتێ دوو چیرۆكانە، ژ ئالییێ دوو چیرۆكنڤیسانڤە هاتینە نڤیسین، كو كتێب دئازرینت، ئەڤ چەندە پشتی پێداچوونا كتێبێ رۆن دبت.

هەروەها ناڤونیشانێ (كرێكار و چیرۆكی كوردی) ژ دوو گرێیێن ناڤی پێكدهێت، ئەو ژی ( كرێكار)، ( چیرۆكی كوردی)، ب ڤێ چەندێ، وەكو دوو بابەتێن ژهەڤ جودا دهێنە پێشچاڤ، هەرچەندە د ناڤەرۆكا كتێبێدا باسێ وان چیرۆكانە ئەوێن ب رەنگەك ژ رەنگان كێشەیا كرێكاری دئازرینت، لەورا (كرێكار د چیرۆكا كوردیدا) ل گەل ناڤەرۆكا كتێبێ دگونجت.

### ٢- ناڤونیشانێن ب زمانەکی هێمایی و هونەری هاتینە دارژتن:

د ڤان جۆرە ناڤونیشاناندا، ئاماژەیەکا راستەوخۆ بـۆ ناڤـەرۆك و بابـەتێ تێـدا خویـا نابـت، بـەلکو پـتر ب دەربڕینـەکا ئـەدەبی هاتینـە دارژتـن، پـەیڤێن وی پەیوەندییەکا یەکسەر ب بابەتێ کتێبێڤە نینـە، پـتر ژ واتایـەکێ و خواندنـەکێ د هزرا خوەندەڤانیدا دئازرینت، چونکی هندەك جاران هونەرێن رۆنبێژی تێدا هاتینـە پەیرەوکرن، لەورا پشتی خواندنەکا هوور و تێهزرینەکا کوور بۆ کـاری دێ گەهینـە رامانا درست. د ڤی جۆرێ ناڤونیشانیدا، زمان بۆ خوە دهێتە ب کارئینان، لەورا هەتا رادەیەکی ئەرکێ شعرییەتێ جهێ خوە تێدا کرییە.

د رەخنەیا چیرۆکا کوردیدا، بـۆ نموونـە ناڤونیـشانێن هونـەری ئەڤەنـە( دەرزی ئاژنی خەمەکان)، ( شیعرییەتی دەق و هەنگوینی خوێندنەوە — دەق و رەخنـە)، ( لەناو بازنەی دەقدا- ڕەخنەو لێکۆڵینـەوەی ئـەدەبی)، ( بیـاڤێ خوانـدنێ- چـەند ڤەکۆلینەك دەربارەی چیرۆکا کوردی)، (چەند رێیەك بۆ دەقی)، (ل بـەر دەرازینکـا تێکستان)، (لە تەك فینۆمینە ئەدەبییەکاندا)، ( وەغـەرەك دنهێنیـێن دەقـی دا- چەند ڤەکۆلینێن ڕەخنا ئەدەبینە ل دور چیرۆکا دەڤەرا بەهدینان) .

وەکو دیار ئەڤ ناڤونیشانەژی گـرێیێن ناڤینـە و دارژتنـەکا هونـەرێ ئـەدەبی هەنە، دەمێ چاڤێ مرۆڤی ڤێ دکەڤت، واتایا وان شێلییە، وەکو بۆ مە دیار بـووی ناڤونیشان دبتە نیشانە بۆ بابەتێ کتێبێ، ل ڤێرێ ئەڤ نیـشانە مـژەوی و شـێلینە، چونکو ب زمانـەکێ هونـەری هاتینـە دارڕژتـن، لـەوما گەلـەك جـاران دێ بیـنین ناڤونیشانەك لاوەکی دگەلدا هاتییە.

پەیوەندی د ناڤبەرا ناڤونیشانی و کارێ ویدا هەیـە، بیاڤـەکێ نـاڤبڕ دناڤبـەرا واندا هەیە، دەمێ کار شعریتر بت ژ ناڤونیشانی، ناڤونیشان دبتە کلیل بۆ ڤـەکرنا کۆدێن دەقی و دەستنیشانکرنا واتایێن وی، بەلێ دەمـێ کـار خـودان پێکهاتـەکا

ئاسایی بت، ئانکو ناڤونیشان شعریتر بت وی دەمی کار دبـت رێـك بـۆ گەهـشتنا واتاییێن ناڤونیشانی. دبت گەلـەك جـاران د ڤـەکۆلینێن رەخنەییـدا ئەڤـە بهێتـە ئەنجامدان، لەورا بۆ شیکرنا ناڤونیشانێن هونەری یێن رەخنـەیا چـیرۆکا هونـەرییا کوردی و گەهشتنا واتـاییێن وی، مـە پـشتبەستن ب کـاری کرییـە، وەکـە د ڤـان نموونان‌دا دیار دبت:

- ( دەرزی ئاژنی خەمەکان )

دیارە ئەڤە ناڤونیشانەك هونەرییە و ب گرێیەکا ناڤی هاتییە دارژتـن، د ڤـی ناڤونیشانیدا مەجازەکا سەربەست هاتییە پێکئینان، وەکو ئەم دزانین خەمان شوون دەرزیك نینن، بەلکو کارتێکرن هەیە، لەورا دەرزی ئاژن مەرەم ژێ ئەو شـوونوارێن خەم ل نك مرۆڤی دهێلن، ئانکو ئەنجام ب رێکا هۆکاری هاتییە دارژتـن. دەرزی : هۆکارە، کارتێکرن (شوونوارێن خەمان): ئەنجامە، بەلگە: خەم

دیـارە ب کارئینانـا ڤـی ناڤونیـشانی بـۆ هەسـتێ رەخنـەگری دزڤـرت، وەکـو چیرۆکنڤیسەکی هەسـت نـازك و کاریگـەرییا وی ب بەرهـەمێ ئـەدەبی، نـەمازە کتێب، دەقێن ئەدەبی ژی ب خوەڤە دگـرت، دیـسان رەخنـەگر ڤـەکۆلینا خـوە ب کـارەکی کـارتێکراوی ل قەلـەم ددەت، دەمـێ دبێـژت " زیـاتریش بـە کـارێکی خۆرسکی (ئینتیباعی) دەزانم"[١٧]. دبت ژی ناڤونیشان ئاماژە بت بۆ هنـدێ کـو دەقێن ئەدەبی شوون دەرزیکێن خەمانە، ئانکو کارتێکرنا خەمان ل سەر نڤیسەری، د ئەنجامدا دەقا ئەدەبی دهێتە بەرهەم، نەمازە کو کتێـب دەقـێن ئـەدەبی ژی ب خوەڤە دگرن.

- ( شیعرییەتی دەق و هەنگوینی خوێندنەوە — دەق و رەخنە)

وەکو دیار ناڤونیشان نە زانستی و بابەتییە، ئانکو ب زمانەکێ راستەوخۆ نـە هاتییە دارژتن، کو ب رێیا وی ئەم یەکسەر بزانین بابەتێ کتێبێ چـییە، بـەلکو ب

زمانەكی رەمزییە، لەورا ژی ناڤونیشانێ لاوەكی د گەلدا هاتییە، ئـەو ژی (دەق و رەخنــە) ناڤونیــشان ژ لێكـدانا دو گــرێیێن نــاڤی پێكـدهێت، د گرێیــا دووێــدا خواســتنەكا ڤەشــارتی درســت كرییـــە، چــونكی خوانــدن ب شــانا هنگڤینـــی لێكچواندییە، ئـانكو خوێندنـەوە، خواسـتییە، شـانا هنگڤینــی ژێ خواسـتییە و هنگڤین خواستییە .

رەخنەگری ژ ئالییێ دارژتنا رێزمانیڤە هەڤكێشەك درست كرییە، ئالییەكێ وێ ( شیعرییەتی دەق) و ئالییێ دووێ ( هەنگوینی خوێندنەوە) یـە، ب راسـتی دەمـێ مرۆڤ دخوینـت، مـەرەما رەخنـەگری ژی نزانـت، وی ب خـوەژی — رەخنـەگری- ئاماژە بۆ نە كرییە، بەلێ دەمێ مرۆڤ پێشەكییا كتێبێ دخوینت و ئەو هزرێن تێدا هاتینە ئازراندن، هەروەسا دەمێ ناڤونیـشانێن بابـەتێن د دوڤـدا دهـێن دبینـت، واتایا وی و مەرەم ژ دارژتنا وی ب ڤی رەنگی رۆن دبت، رەخنـەگر د پێـشەكییێدا ئاماژە دكەتە گوهورینا دەقی و باسێ دەقێ نووخواز و دیتنـێن نـوو بـۆ دەقـی و پەیدابوونا شعرییەتێ دكەت و ژ ئەنجامێ گوهورینا رەخنەیێ و بەرێخوەدانا وێ بۆ دەقی و گوهورینـا وێ — رەخنـەیێ- ب خـوەژی، هـەتا دگەهتـە هنـدێ ب دەق ددانـت، دەمــێ دبێــژت: "رەوتــی بــەرەوپێش چــوونی رەخنــەی ئــەدەبی- تــا هەنووكەش- رووبەرێكی فراوانی بۆ تیۆرییە رەخنەییە نوێیەكان كـردەوە و گـەلێ دەرگای توێژینەوە و راڤەكردن و دیالۆگێتی و تەئویلی دەقـی ئـەدەبیی بـۆ خـستە سەر پشت. ئێستا رەخنەگرێكی ئەدەبی و توێژەرێكی ئەدەبی نییە ( رەخنە) بـە ( دەقێكی تر) نەزانێ كە لە بنەڕەتدا لە سەر دەقی یەكەم دادەمەزرێ "[18]، ئـانكو د ناڤونیشانیدا، هـەروەكو بێـژت: دەقـێ شـعرییەتێ بەرجەسـتە بكـەت، ئـەنجام هنگڤینـــێ خوێندنێیـــە، ئـــانكو ب پەیـــدابوونا دەقـــێن نـــوو ل دوڤ بۆچـــوونێن فۆرمالیستێن روس، رەخنەگر ب هەمان زمانێ دەقی، دەقی شلوڤە دكەت. دیـارە

ئەڤ ناڤونیشانە ئاماژەیە بۆ بۆچوونێن رەخنــەگری و پــەیرەوکرنا وان د ڤــەکۆلینێن ویدا، چونکی ل دەقێن نوو ڤەدکۆلت.

دیسان ناڤونیشان وێ واتایێ هەلدگرت کو دەقێن شعرییەتێ بەرجەستە بکەین، واتا و ئیحائێن هەمەجۆر ددەن، لەورا خواندنێن هەمەجۆر هەلدگرن، ل ڤێرێ دیــار دبت، ناڤونیشان ئیحائە بۆ شێواز و رێبازا رەخنەیی، نەکو بــۆ بابــەت و ناڤــەرۆکا کتێبێ.

**- ( بیاڤێ خواندنێ- چەند ڤەکۆلینەك دەربارەی چیرۆکا کوردی )**

ناڤونیشان نە راستەوخۆیە و واتایێن بەرفرەهتر ژ واتایا وان هەردوو پەیڤێن ژێ پێکدهێت هلدگرت، کــو گرێیــەکا نــاڤی درســت کرییــە، لــەورا ژی ناڤونیــشانەك لاوەکی د بندا هاتییە ئەو ژی ( چەند ڤەکۆلینەك دەربارەی چــیرۆکا کــوردی )یــە، ئانکو زمان هێمایی یە، چــنکو پــەیڤا خوانــدن ل ڤێــرێ ب تنــێ واتایــا خــوە یــا فەرهەنگی هلناگرت، بەلکو دیارە رەخنەگری رامانەکا بەرفرەهتر دایێ، ئەڤ چەندە پشتی خواندنا کتێبێ، ب رەنگەکی نە یەکسەر بۆ مرۆڤی خویــا دبــت، نــەمازە ژ بابەتێ یەکێ د کتێبێدا، ئەوێ ب ناڤێ (دەق و بیاڤێ خاندنێ)، دیارە ئــەڤ بیــاڤێ خواندنێیە رەخنەگری کرییە ناڤونیشان، د وی بابەتیدا پەیڤا خواندن ب مــەرەما ( تیۆرا خواندنێ یا رەخنەیی) هاتییە، هەروەکو رەخنــەگر دبێــژت: " دەمــێ دبێــژن خواندن مەبەست ژێ تیۆرا خاندنێیە ئەوا دهێتە هژمارتن نــویترین تیــۆرا رەخنــێ "[١٩]، مەرەم ژ بیاڤی ئەو بیاڤەیە یێ ئەڤ تیۆرە تێدا دهێتە ئەنجامــدان و ئــەرکێ خوە تێدا ب جھ دئینت.

ئەڤ بیاڤە گرێدای هەردوو ئالییێن دەقینە، ئالییێ ئاشکرا، فۆرم و رۆخسارێ پەیڤان و ئالییێ دی یێ ڤەشارتی، واتا و هێــزا وان، رەخنــەگر د ڤــی بیاڤیــدا دبێــژت:" بیاڤەك باش هەیە د ناڤبەرا ڤان هەر دو ئالاندا و ئەڤ بیاڤەیە ژی دهێتە خواندن و

راڤەکرن و خواندەڤان د ناڤ وی بیاڤیدا کـار دکـەت"[20]، د ڤـێ تیۆرێـدا، دەمـێ گرنگی ب دەقی دهێتە دان وەکو دەقەکی سەربەخۆ ل سەر حـسێبا نڤیـسەرێ وێ، ئانکو خواندەڤان-رەخنەگر — د ناڤ دەقیدا کار دکەت و ب ڤێ چـەندێ دەق دبتـە بوونەوەرەك زێندی و خودان دەستهەلات و جهێ کەسـایەتییا نڤیـسەری دگـرت، ل دۆر ڤێ چەندێ رەخنـەگر دبێـژت: " ئـەڤ زینـدی یـاتی یـا بیاڤـەکێ دی ددەتـە خواندەڤانی بـۆ خوانـدنێ و ڤـەکۆلینێ و دانوسـتاندنێ ( دگـەل دەقـی نـە دگـەل نڤیسەری) کو ئەڤ ژی دبیتە ئەگـەرا بوونـەکا نـووی یـا دەقـی"[21] ئـەڤ بیاڤەنـە رەخنەگری بۆ تیۆرا خوانـدنێ دەستنیـشان کـرین و دیـارە ل سـەر بنـەمایێ ڤـێ ڤەکۆلینێ و ئەو بیر و بۆچوونێن تێدا هاتین رەخنەگری ناڤونیشانێ کتێبـێ دانایـە، هەروەکو گەلەك جاران چیرۆکنڤیس نـاڤێ چـیرۆکەکا خـوە دکەتـە ناڤونیـشان بـۆ کۆمەلا خوە، هەرچەندە رەخنەگری ئەڤ تیۆرە د ڤەکۆلینێن کتێبـێ یـێن دی ژیـدا هەتا رادەیەکی پەیرەو کرینە.

**- ( پەیڤێن بێ پەردە — چەند ڤەکۆلینێن رەخنا ئەدەبینـە ل دۆر چـیرۆکا دەڤـەرا بەهدینان)**

دەربڕینەکا هونەری هێمـایی یـە، کـو گرێیـەکا نـاڤی درسـت کرییـە، لـەورا ناڤونیشانێ لاوەکی دگەلدا هاتییە ، وەکو ئەم دزانین پـەیڤان پـەردە نیـنن، لـەورا پەیڤا (پەردە) یان ژی (بێ پەردە) مەجازەکا سەربەستە، ئـەنجام ب رێیـا هوکـاری هاتییە دەربرین، ئانکو بێ پەردە هۆکارە و ئەنجام رۆنی و ئاشکەرایە.

ئەڤ ناڤونیشانە دبت دوو واتایـان هلگـرت، یـا یـەکێ: دبـت رەخنـەگری ئـەڤ دەربڕینە ژ دەربڕینا ئەدەبێ بێ پەردە وەرگرتبت، ئانکو ب هـەمان واتـا، چـونکی ئەدەبێ بێ پەردە ئەوە یێ هەموو تشتی ب ئاشـکەرایی، بـێ شـەرم دەردبـڕت، ل ڤێرێ دبت رەخنەگری ئەڤ واتایە مەبەست بت، ئانکو پێدڤییە رەخنە ب وێرەکـی و

بیٚ شەرم بهیٚتە ئەنجامدان و ئالییٚن نیٚگەتیڤ و پۆزەتیڤ بهیٚنە خویاکرن، مرۆڤ دگەهتە ڤیٚ واتاییٚ بۆ ناڤونیشانی، ژ ئەنجامیٚ خواندنا بیر و بۆچوونیٚن رەخنەگری دەربارەی رەخنەییٚ د کتیٚبیٚدا دیار دبت بۆ نموونە، ل دۆر رەخنەگریٚ کورد دبیٚژت:
" نەشیٚت ب ڕاستی و درستی بڕیاریٚن خو ل سەر دەقیٚ ئەدەبی یان کارەکیٚ هونەری بدەن دا پەیوەندییٚن وی ل گەل خودانیٚ دەقی تیٚك نەچن"[٢٢]، ئانکو وی دڤیٚت دیار بکەت، کو پیٚدڤییە رەخنەگر ب ڤی رەنگی نەبت، بەلکو بەرەڤاژی ڤیٚ چەندیٚ بیٚ ویٚرەك بت.
واتایا دوویٚ یا ناڤونیشان هلدگرت و دبت رەخنەگری مەبەست بت، ئەوە کو کاریٚ رەخنەگری لادانا پەردانە ل سەر کاریٚ هونەری و ئەدەبی، چونکی بەرهەمیٚ ئەدەبی ب زمانەکیٚ پڕی ئیحاو و نە راستەوخۆ دهیٚتە نڤیسین، لەورا ئەڤە دبنە پەردە بۆ دەقی و کاریٚ رەخنەگری لادانا ڤان پەردانە، لەورا ژی پیٚدڤییە زمانیٚ رەخنیٚ ییٚ رۆن و راستەوخۆ بت، ئانکو پەیڤیٚن بیٚ پەردە بن. بەلگەژی بۆ ڤیٚ واتاییٚ، ئاخفتنەکا رەخنەگری ب خوەیە، دەمیٚ دبیٚژت: " رەخنەگریٚ مە نەبوویە پرەك د نیٚڤبەرا نڤیسەری و خواندەڤانیدا. . چنکو ئەڤیٚ چەندیٚ شەهرەزایەك بەرفرەهـ ژ رەخنەگری دڤیٚت د واریٚ دەروونی و جڤاکی و میٚژوویی‌دا، دا بشیٚت گریٚکیٚن کاریٚ هونەری ڤەکەت و وان پەردیٚن هونەرمەندی ب سەردائینانین راکەت و راستییٚ روهن و ئاشکەرا بکەت"[٢٣]

د ڤەکۆلینەکیٚدا ئاماژە هاتییە کرن بۆ پالدەریٚن ب کارئینانا ناڤونیشانیٚ هونەری بۆ ڤەکۆلینا رەخنەیی، ئەو ژی : رەخنەگر ب بەرهەمیٚ ئەدەبی کاریگەر بت و چەندەك ژ هەلٚچوونا دانەریٚ بەرهەمی دهیٚتە ڤەگوهازتن بۆ وی. گەلەك ژ وان ئەویٚن ئەڤ ناڤونیشانە بۆ ڤەکۆلینیٚن خوە ب کارئینانین، هەلبەستڤانن و گەریانا وان ل ڤان دەستەواژەییٚن هونەری، وەکو هندیٚیە دەمیٚ ل ناڤونیشانان بۆ

هەلبەستێن خوە دگەڕن. رەخنەگر دەمێ ناڤونیشانی بۆ ڤەکۆلینا خوە هەلدبژێرت، دڤێت چاڤدێرییا پرنسیپێن جوانکارییێ بکت، دا پتر کاریگەر بت و زوو نەهێتە ژ بیرکرن .[٢٤]

دبت ئەڤ پالدەرە بۆ رەخنەگرێ کورد ژی بگونجت نەمازە گەلەك ژ وان رەخنەگرێن ناڤونیشانێن هونەری ب کارئینایین، چیرۆکنڤیسن، وەکو (رەوف حەسەن، سەمەد ئەحمەد، جەلال مستەفا، سەبیح محەمەد حەسەن، عەبدولخالق سولتان، سەلام بالایی کو پەخشان نڤیسە).

وەکو ژ شیکرنا وان ناڤونیشانان دیاربووی کو پترییا وان ئاماژەنە بۆ شێوە و جۆر و میتۆد و رێبازێن رەخنەیی، نەکو ئەو بابەتێن کتێب ب خوەڤە دگرن، نەمازە پترییا وان کتێبێن ئەڤ ناڤونیشانە بۆ هاتینە ب کارئینان ڤەکۆلینێن هەمەجۆر هەمبێز دکەت، لەورا ژی دبت ئەڤ ناڤونیشانە پتر دگەل وان بگونجت، چونکی ئەو ڤەکۆلین ل دۆر تێکست و نڤیسەرو بابەتێن هەمەجۆرن، لەورا هەلبژارتنا ناڤونیشانێن گشتی و ب زمانەکێ زانستی دەربڕینێ ژ وان هەموو بابەتێن هەمەجۆر بکەت کارەکێ ب ساناهی نینە.

هەروەها پترییا وان کتێبان یێن سالێن پشتی دوو هزارێنە (دەرزی ئاژنی خەمەکان) تێ نەبت، د ڤان سالاندا رەخنەیا کوردی بەر ب رێباز و میتۆدێن نوویێن رەخنێ چوویە، دیارە " دارشتنا ناڤونیشانی ب سەقایێ رەوشەنبیری یێ زالێ ل ماوەیەکێ دەست نیشانکری، داخبار دبت"[٢٥] ، دبت ژ بەر ڤێ چەندێ بت، پترییا وان ناڤونیشانان ئیحائن بۆ شێواز و رێبازێن رەخنەیی.

وەکو بۆ مە خویا بووی پترییا ناڤونیشانان –ئەگەر نەبێژن هەموو- ژ ئالییێ دارژتنا رێزمانیڤە گرێیێن ناڤینە، ب ڤێ چەندێ رەخنەگرێ کورد ژی ژ داب و نەریتێن ناڤ لێکرنێ لانەدایە، چونکی" ناڤبوون (الاسمیە) ساخلەتەکێ بژارەیە د

بنياتێ ناڤونيشانی و رستەيا وێدا، هەتا كو نێزيك دبت ببتە ساخلەتا بنەڕەتی د ناڤونيشانكرنێدا"[٢٦]

ناڤونيشان ب دارێتنا راستەوخۆ ب رێژا (٦٥٪) هاتينە بكارئينان، هەرچەندە هەموو ژ ئالييێ رۆنی و زانستييێڤە نە د يەك ئاست دانە. ناڤونيشانێ هونەری ژی جهەكێ باش هەبوويە، بەلێ ب رێژەيەكا كێمتر كو (٣٤٪) بوويە، پترييا وان ئاماژەيە بۆ شێوە و جۆرێ رێبازا رەخنەيی، نەك بابەتێ كتێب ب خوەڤە دگرت.

ب ڤێ چەندێ خويا دبت كو ئەركێ تێگەهاندنێ پترژ يێ شعرييەتێ جهێ خوە كرييە، بەلێ يێ هەلچوونێ تێدا خۆيا نابت، چونكی گەلەك جاران ناڤونيشان رازيبوون يان نە رازيبوونا رەخنەگری ل سەر بابەتی ئانكو هەستێن وی هلدگرت ، بەلێ دڤان ناڤونيشاناندا ئەڤ چەندە خويا نابت.

**دووەم: كارێ رەخنەيی ژ ئالييێ زمانيڤە:**

**١- زمان و ب جهئينانا ئەركێ هەلچوونێ**

د ڤەكۆلينا مەدا ل زمانێ دەقێن رەخنەيی يێن چيرۆكا هونەرييا كوردی بۆ مە ديار بوو داكۆكيكرن ل پەيامهنێری – رەخنەگری- ب رێژەيەكا بەرفرەه ديارە، وەكو بۆ نموونە د ڤان كتێباندا دهێتە ديتن ( پێشوازيی خاوەن شكۆ و دوو چيرۆك نووس)، (چيرۆكی هونەريی كوردی)، (دەرزی ئاژنی خەمەكان)، (كامەران موكريی چيرۆكنووس)، (لێكۆڵینەوە و بيبليۆگرافيای چيرۆكی كوردی)، (كاريگەری بيری نەتەوەيی لە گەشەسەندنی كورتە چيرۆكی كورديی لە كوردستانی عێراقدا)، (ئافرەت لە چيرۆكی كوردی دا)، ( كرێكار و چيرۆكی كوردی)، (چيرۆكی نوێی كوردی)، ( چەند گوتارەكێد رەخنەيی)، (هزر و شێواز لە چيرۆكی كورديدا)، ( لە ناو بازنەی دەقدا).

ئــەڤ دووپاتکرنــە ل پــەیامهنێری و بۆچــوون و دیتنــێن وی و د ئەنجامــدا ب جهئینانا ئەرکێ هەلچوونێ د زمانێ ڤان کتێباندا د چـەند سـیمایاندا بەرجەسـتە دبت، ئەو ژی ئەڤەنە:

١-١- ئەڤ دووپاتکرنــە د زمــانێ هەلسـەنگاندنێدا خویـا دبـت، کـو د رەخنـەیا کوردیدا پتر کەسایەتییا رەخنەگری زالــە، چـونکی ب زۆری بریـاردانێ ب خوەڤـە دگرت، پتریيا جاران ئەڤ بریاردانە سیماییێن هەلچوونێ هەلدگرن.

١-٢- بەرجەستەبوونا جهناڤێ ئاخفتنکەر ب رێژەیەکا مــەزن د زمــانێ رەخنـەیا ڤان کتێباندا دیارە، ئەڤەژی دووپاتکرنە ل پەیامهنێری –رەخنەگری- د زمانیـدا و د ئەنجامدا ب جهئینانا ئەرکێ دەربرینێ (هەلچوونێ)یە، کو رەخنەگری ئەڤ چەندە ئەنجامدایــە بــۆ دەربرینــێ ژ بۆچــوونێن خــوەیێن گــشتی یــان یــێن ل دۆر دەقــێ چیرۆکنڤیسی دکەت، یان دەمــێ هەلسەنگاندنێ چ ب باشـی یـان خرابـی ئـەنجام بدەت، ئەڤ دەربرینە بۆ ڤێ مەرەمێ هاتینە ب کارئینان ئەڤەنە: پێم وایــە...، بــە لای منەوە...، من لەو بروایەدام...، بە بروای من...، لەو بروایەشدام...، من پێم وایە...، من وا دەزانم...، من وای بۆ دەچم...، ...هتد,

کەواتە مروڤ دشێت بێژیت ئەڤ رەخنەیە ژ بۆچـوون و شـێوازێ زانـستی ددۆرن و ل سەر رێبازێن رەخنــەیا ئــەکادیمی نـا چـن، بـەلکو زێـدەتر شـلوڤەکرنێن کەسـی و بەرهزرن، ژبەر ڤێ چەندێ ژی زۆر جار دل گرانی دناڤبەرا رەخنەگری و نڤیـسەریدا درست دبیت.

١-٣- دارژتنا حێبەتی و سەرسورمانێ ئـەرکێ هەلـچوونێ دزمانیـدا بەرجەسـتە دکەت، ئەڤ چەندە ب ڤی رەنگی د ڤان نموونەیاندا دیار دبت :

-(حسێن عـارف) ل دۆر چیرۆکا (مەسەلەی ویـژدان) باسـێ (ئەحمــەد موختـار جاف)ی دکەت، دەمێ دبێژت : "بێگومـان مــن بــەو نیــازە لــە مێــژووی ژیــانی

دەكۆڵمەوە ، بەتايبەتى لەو ساڵانەدا، تا وەرامى ئەو پرسيارەم دەسگير ببێ كە ئايا ئەحمەد موختارێك كە خۆى يەكێك بووە لە كار بەدەستە گەورەكانى ڕژێم ،چ عەجەب لەو چيرۆكەيدا (ئەگەر چى بلاۆيشى نەكردۆتەوە) ئەو هێرشە توند و تيژەى بردۆتە سەر و لە نێوان كاربەدەستانى و بازرگان و دەرەبەگەكانى پشتيوانيەوە ، بەو جۆرە گوناهبار و ڕيسواى دەكات ؟!"[٢٧]، ڤێرێ پەيڤا عەجەب و نيشانا سەرسوڕمانێ ڤێ حێبەتييێ دزمانێ ڕەخنەگريدا بەرجەستە دكەت .

-(صەباحى غالب) ل دوَر هەڵوێستەكێ د چيرۆكا (گەرميان و كوێستان) يا (جەمال بابان)يدا، دبێژت: "ئەوەى جێگاى سەرسوڕمانە ئەوەيە كە جەمال بابان تاقە دەوارێك لە خێڵ لە هاوار بەجێ دێڵێ ، كە لە ياساو دەستوورى ئەواندا ئەوە كارێكە هەرگيز ڕوونادا"[٢٨]، ديارە ڕەخنەگرى ل ڤێرێ پەيڤا سەرسوڕمان ب خوە ب كارئينايە .

ديارە ڕەخنەگر بۆ دەربڕينا سەرسوڕمانا خوە پەيڤێن عەجەب سەرسوڕمان و شێوازێ پرسياركرنێ و نيشانا سەرسوڕمانێ ب كارئينايە .

١-٤- دەمێ ڕەخنەگر دەربڕينێ ژ خەمبارى و مخابنييا خوە دەربارەى هندەك هەلويست و هەڵەيان د دەقێ چيرۆكێدا دكەت ، ل ڤێرێ ب زۆرى پەيڤا (بەداخەوە) ب كار دئينت وەكو د ڤان نموونەياندا خويا دبت:

-(صەباحى غالب) دەربارەى گرنگيدان ب ژنێ د چيرۆكا (لە خەوما)دا، دبێژت: "بەلاَم بەداخەوە نەك نەيتوانيوە ئەو كارە پيرۆزە بكا بەڵكو ڕووى ڕاستەقينەى ئافرەتى كوردى شێواندووە"[٢٩].

-(سەمەد ئەحمەد) د باسكرنا چيرۆكا (خۆشەويستى لە چاخى بەردينەدا) يا (ئاوات محەمەد)ى دبێژت: "پێم وايە دەبووە خاوەنى داهێنانێكى مەزن، كە

بەداخەوە، لە وێنە گرتنی هەموو دیمەنەکاندا، هەروەها لە دروستکردنی گرێکانـدا وەکو یەك سەرکەوتوو نییە"[٣٠].

١-٥- دەربڕینا ڕەخنەگری بۆ هەست و کاریگەربوونا خوە ب دەقێ چیرۆکێ، وەکو دڤان نموونەیاندا دیار دبت:

-(حەمە سەعید حەسەن) دەربارەی روودانا کوشتنا قارەمانێن چیرۆکا (هەلاَتن) یـا ( فازیـل کـەریم ئەحمـەد)ی، دبێـژت: " چـیرۆکی هـەلاَتن هەژانـدمی کاریگەریەتییەکی ئەفسووناوی لە ناخمدا جێ هێشت"[٣١].

- (حەسەن جـاف) ل دۆر وێنـەیێن چـیرۆکا (کـۆتره خـەڵووزێك)یـا (کامـەران موکری) دبێژت: "کێ بێت ئەم وەسفە بخوێنێتەوە هەموو دەمارەکانی لەشـی گـرژ نەبێت و گشت تووکەکانی سەری رەپ رانەوەستن لە داخی زوڵم و زۆرداری، دەبێ چ وەسفی لەمە جوانتر و کاریگەرتر بێت"[٣٢].

١-٦- هندەك جاران ڕەخنەگر ب زمانەکێ سوزدار دەقا ئەدەبی پێشـچاڤ دکـەت، دیارە ئەڤە دەربڕینێ ژ کاریگەرییا وی ب دەقان و بابەتێ چیرۆکێ دکەت و ب ڤـێ چەندێ  ئەرکێ هەڵچوونێ ل سەر زمانی زالّ دبت " ئەرکێ هەڵـچوونێ دئاخفتنـا ئەدەبییا سۆزداردا زالّ دبت"[٣٣]. ئەڤ چەندە د کتێبا (کاریگەری بیری نەتەوەیی لە گەشەسەندنی کورتە چیرۆکی کوردیی کوردستانی عیراقدا ١٩٦١-١٩٧٠) خویایە.

ئەڤ چەندە هـەتا رادەیـەکی د کتێبـا (لێکۆڵینـەوە و بیبلیۆگرافیـای چـیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩) ژیدا بەرجەستە دبت، هەرچەندە ئەڤ کتێبـە هنـدەك ژ وان سیماییێن دی ژی بێن مە ئاماژە پێ کرین ب خوەڤە دگرت.

ژڤێ چەندا بۆری و ژڤان سیمایان بۆ مە خویـا دبـت، کـو د ڤـان بەرهەمانـدا داکۆکی ل پـەیامهنێری هاتییـە کـرن د ئەنجامـدا زمـانی ئـەرکێ هەڵـچوونێ ب جهئینایە .

١-٧- دگەل پەیدابوونا رێبازێن رەخنەیا بەرسڤدانا خوێندەڤانی، ئانکۆ خوێندەڤان —رەخنەگر- واتا دەقی دەستنیشان دکەت، هەروەکو د رێبازا هلوەشانگەرییێدا کـو دیتن و دەستنیشانکرنا واتایا دەقی ل دوڤ تایبەتمەندییێن وی یـێن خـودی و بابـەتی ناهێتە کرن، بەلکو ل دوڤ کارتێکرنێن دەروونی و زمانی و هـزری و کەسـۆکی یـێن خوێندەڤانی دهێتە کرن، ئانکو دەق دبتە ڕەنگ ڤەدانا کارتێکرن و بارێ دەروونی و رەوشەنبیرییا تاکی، ئارمانجا رەخنەگری ژی ل ڤێـرێ ئـەوە کـو دووبـارە دەقـی ب زمانێ وی یێ دەستپێکی داڕێژت، ئانکو ب زمانەکێ نێزیکی یێ شعرێ و ب ڤـێ چەندێ رەخنە دبتـە دەقـەکێ ئافرانـدنێ و ژ سـیمایێ زانـستی دوٚر دکـەڤت(٣٤).

رەخنەگرێن کورد ژی، ل ڤێ داوییێ بەرەڤ ڤی ئـالی چـووینە و رێبـازێن خوانـدنێ پەیرەو کرینە وەکو بۆ نموونە: ڤەکۆلینێن رەخنەیا کورتە چیرۆکێ، ئەوێن د هەردوو کتێبێن (گوتارێن ڕەخنەیی) و ( چەند رێیەك بۆ دەقی)دا هاتین، ب ڤێ چەندێ ئەو ژی هـەتا ڕادەکـی وان سـیمایان ب خوەڤـە دگـرن، ئـەڤ چـەندەژی هـەر ژ وان ناڤونیشانێن بۆ ڤەکۆلینان ب کارئینایین دیار دبت، وەکو بۆ نموونە: "خواندنەك بـۆ کورتە چیرۆکا ژدەست دانا خەونان"(٣٥)، "بێ گووتارییا کچا کـورد خواندنـەك بـۆ کورتە چیرۆکا بیرهاتنێن کچەکا ئەڤیندار یا تەیب دەشتانی"(٣٦)، دیسان ژ ئـالیێ بابەتێن دهێنە ئازراندن ژی ڤە، وەکو: هەڤدەقی، ناڤونیـشان....هتـد هەروەسـا ژ زاراڤ و شێوازێن زمانێ پێ هاتییە نڤیسین. ژ بلـی کـو ب گـشتی و ب رەنگـەکێ نەڕاستەوخۆ، ل دوڤ سیماییێن ڤێ رەخنەیێ دیارە، کو دەربڕینێ ژبۆچوون و دیتنێن خواندەڤانی- رەخنەگر- دکەت.

هەروەها د ڤەکۆلینێن کتێبـا (گۆتـارێن ڕەخنـەیی)دا ژی سـیماییێن خـودی و بۆچـونکاری خویـا دبـن، ئـەوژی وەکـو: ژ شـێوازێ هەلّـسەنگاندن و باسـکرن و

رەخنەلێگرتنا دەقان دیار دبت، کو ژ هەڵچوونا وی دیارە، یان ل گەل بۆچوونێن دەقییە و ب پوزەتیڤ پێ کاریگەر بوویە، لەورا هەلبژارتییە دا ستایشا وی بکەت.

خالەکا دی د ڤێ کتێبێدا خودییەتا رەخنەگری بەرجەستە دکەت ئەوە کو رەخنەگر گەلەك پەیڤێن ( هێژا، سەیدا) بۆ ناڤئینانا چیرۆکنڤیسان ب کارد ئینت و ئەڤەژی دەربڕینێ ژ دیتنێن وی یێن پێش وەخت ل سەر چیرۆکنڤیسان دکەت.

کەواتە ئەم دگەهینە وێ چەندێ، کو د ڤان هەردوو کتێباندا سیمایێن دووپاتکرنێ ل پەیامهنێری دیارن، چونکی بابەت پتر دەربڕینە ژ بۆچوون و دیتن و خواندنا پەیامهنێری دکەت. ل داوییێ هەکەر ئەم رێژەیا وان کتێبان دیار بکەین ئەوێن دزمانێ واندا پتر داکۆکی ل پەیامهنێری هاتییە کرن و ئەرکێ هەڵچوونێ ب جهـ ئینای بۆ مە دیار دبت کو (٥٠٪) نە، پترییا ڤان کتێبان دکەڤنە د ناڤبەرا سالێن (١٩٧٣-١٩٩٠) ، ب تنێ سێ کتێب نە بن ئەو ژی ب ڕاستی وەکو ژ پێشچاڤکرنا وان خویا بووی خودان تایبەتمەندییا خوەنە، هەر چەوا بت ئەڤ کتێبە پتر ب زمانەکێ ئاسایی هاتینە نڤیسین، لێ پڕی دەربڕینێن خودینە و بۆچوون و هەستێن رەخنەگری پێشچاڤ دکەن، و ب ڤێ چەندێ دیتنا (بەختیار سەجادی) ل دۆر زمانێ رەخنەیا سوننەتی- ل دووڤ ناڤکرنا وی- د زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی ژیدا هەتا رادەیەکێ جهێ خوە دبینت.

**٢- زمان و بجهئینانا ئەرکێ شعرییەتێ:**

ئەڤ ئەرکە دەمێ داکۆکی ل پەیامێ دهێتە کرن و ب خوە دبتە ئارمانج و ب تنێ دەربڕینێ ژ خوە دکەت ب جهـ دئێت، بۆ خوە ب کار دئێت. ئەڤ چەندە د زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردیدا ب دوو رەنگان دهێتە دیتن:

**٢ـ ١ـ دەمێ پەیام دبتە دەقەکێ نوو:**

مەرەم ژ ڤێ چەندێ ئەوە کو نڤیسینا رەخنەیی وەکو پەیام ئەرکێ شعرییەتێ تێدا زاڵ بت، هەتا وێ رادەیێ دەقەکێ نوو ئاڤا بکەت، ئانکو نڤیسینا رەخنەیی

سیماییێن خوە وەکو ڤەکۆلینەکا رەخنەیی ژ دەست ددەت و بەر ب ئاڤاکرنا دەقەکا ئەدەبی ل سەر بنەمایێ دەقێ یەکێ — دەقێ رەخنە لێ دهێتە گرتن- دچت، ئانکو بەر ب نڤیسینا ئافراندی دچت. د سنوورێ ڤەکۆلینا مەدا ئەڤ چەندە د دوو نڤیسینێن رەخنەییدا بەرچاڤ دکەڤت، ئەوژی (پەلاّس بەلایەنگیرییەوە)یە د کتێبا (چیرۆکی هونەریی کوردیی شێوە و، شێواز، و بونیاد) دا هاتییە، یا دووێ (هەڤرکی ژ بۆ مانا مرۆڤی نەك ژ بۆ وێرانکرنێ) د کتێبا (ل بەر دەرازینکا تێکستان) دا هاتییە بۆ نموونە:

**سیماییێن شعرییەتێ د دەقێ ( پەلاّس بەلایەنگیری یەوە)دا:**

رەخنەگری ئاڤاهیێ دەقی ل سەر دوو پارچەیان دانایە، پارچەیا یەکێ سێ بنیاتێن مەزن ب خوەڤە دگرت و هەر یەك ژ وان ژ چەندین بنیاتێن بچووك (رستەیان) پێکدهێت، دەربڕینا (بەفرە... بەفر) هەر سێ بنیاتێن مەزن پێکڤە گرێ ددەت، کو دبتە تەوەرێ پێکهاتنا هەر یەك ژ وان، ب ڤێ چەندێ رەخنەگری لادانەکا سینتاکسی درست کرییە، چونکی بەفر وەکو کارا یان بەرکار بۆ رستەییێن هەر بنیاتەکێ ل دەستپێکا وان هاتییە، پاشی ئاخفتن و سالۆخدان ل سەر دهێت، کو ئەڤەژی لادانەکە ژ سیستەمێ رێزمانی، دیسان ئەگەر باسێ دەربڕینا (بەفرە... بەفر) ب خوەژی بکەین دیسان لادانەکێ درست دکەت، کو پەیڤا بەفر یا دووێ کارایە، بۆ پشتی کاری و تەواوکەرێ وی هاتییە ڤەگوهازتن، ئانکو ژ ئالییێ رێزمانیڤە درستە بێژن (بەفر بەفرە)، وەکو مە گۆتی هەر سێ بنیاتێن مەزن پێکڤە گرێ ددەت، کو د بنیاتێ یەکێدا پشتی دەربڕینا (بەفرە...بەفر) پارچەیەك ژ دەقا چیرۆکێ وەکو وەرگرتن دهێت، ئەو ژی " سپی سپی وەك چوڕی شیر .. خاو خاو وەك لۆکەی هەلاجیکراو.. هێمن هێمن وەك تولفە فریشتەی خەوالّووی ئەو ئاسمانە، لە کەشکەلانێکەوە دادەخزان و .."[٣٧]، بنیاتێ مەزنێ یەکێ سالۆخدانا ڤێ

چەندێیە ب زمانەکێ ئەدەبی درستکرنا تەڤنێ ڤی بنیاتی ب رێیا جهناڤێ ئاماژە( ئەمە) بۆ بەفرێ وەکو کارا بۆ جارەکێ ل دەستپێکێ و پاشی ب رێیا جهناڤان بنیاتێن بچووك ( رستە) پێکڤە دهێنە گرێدان، ئانکو ب رێیا ڤەگوهازتنێ بۆ جهناڤێ (ئەمە)، هەروەسا ئامرازێن گەهاندنێ و لێکدانێ ژی هاتییە ب کارئینان وەکو ژ ڤێ نموونەیێ دیار دبت: " راوەستە.. ئەمە پارچە شیعرێکی خەواڵوو نییە لە ژێر زەبری ساتێکی سۆزاویدا لە دەم شاعیرێکەوە هەڵوەریبێ، بەڵکو ( سەربەستە- لازمە) یەکە، وەکو ئەوەی لە کۆرالی کۆنە (دێر) ێکی دێرینەوە هەڵسێت، یا وەکو ئەوەی لە کۆرسی کۆنە نمایشێکی ئایینی و، یا کۆڕێکی...."[٣٨]، ب ڤی رەنگی بەردەوام دبت، دیارە جهناڤێ ئاماژەیێ ( ئەمە) بۆ جارەکێ هاتییە پاشی رستە هەموو ڤەگوهازتنە بۆ وی، وەکو دەمێ دبێژت: بەڵکو (سەربەستە- لازمە)یەکە، ئەڤ (ە) یە ڤەگوهازتنە بۆ( ئەمە)، ئانکو رێکەڤتنە د گەل، دیسان د ڤێ رستەیێدا ئامرازێ گەهاندنێ (بەلکو) هاتییە و ب ڤی رەنگی د رستەییێن دی ژیدا دیسان ئامرازێ لێکدانێ (و) و مۆدفۆرمێ هەلبژارتنێ (یا) دهێت بۆ درستکرنا تەڤنێ ڤی بنیاتێ مەزن.

د بنیاتێ دووێ یێ مەزندا ب هەمان رەنگ دەربڕینا (بەفرە.. بەفر) تەوەرێ گرێدانا بنیاتێن بچووکە، کو دبتە بەرکارێ ڤان بنیاتێن بچووك و بنیاتێن بچووك سالۆخدانا وی دکەن جارەکێ ل نك خەلکێ ئاسایی جارەکا دی ل نك داهێنەر و د بەرهەمێن ئەدەبیدا ب ڤی رەنگی:

**" بەفرە.. بەفر**

ئەوانەی لە کن خۆمان شەڕە تۆپەڵی پێ دەکەن و ، گەمەی لەسەر دەکەن ( بووکی بەفر)یشی پێ ئێژن بەڵاّم لە هەندەران بە تایبەتی ئەوانەی کە لێیان دیوە و ..."[٣٩]. وەکو دیار د ڤی بنیاتی ژیدا بەفر بەرکارە و تەوەرە، ڤەگوهازتنا

رستەیان ب رێیا جهناڤێ نـە دیـار (ێ) دهێتـە ئەنجامـدان و ئـامرازێ لێکـدانێ (بەلآم) بۆ پێشچاڤکرنا دوو بارێن جودا هاتییـە ، ئـەڤ چـەندە جارەکـا دی د ڤـی بنیاتیدا دووباره دبتەڤه. هەروەسا د بنیاتێ مەزنێ سییێ ژیدا ب هەمان رەنـگ ( بەفرە... بەفر) کارایه و تەوەرێ پێکڤەگرێدانا رستەیانه.

ب ڤی رەنگی رەخنەگری پشکا یەکێ ژ دەقا خوه ئاڤا کرییه و ب ڤێ ئاڤاکرنێ تەوەرێ گرنگیدانا رەخنەگری خویا دبت کو ژ دەقێ چیرۆکێ ( بـەفرە) سـەرنجا وی کێشای و پێ کاریگەر بووی، د ئەنجامدا دەقێ خوەیێ نـوو ل سـەر ئاڤاکرییـە، ب ڤێ چەندێ مە نیڤا ئاڤاهییێ دەقی خویا کر، کو رەخنەگری ب شـێوازەکێ بابـەتی سالۆخدانا بەفرێ تێدا کرییه، بەلێ د نیڤا دیدا رەخنەگر قارەمانێ چیرۆکێ ل گـەل بەفرێ د ئاڤاکرنا دەقێ خوەدا پشکدار دکەت و شێوازێ بابەتی دهێته گوهۆرین بۆ خودی، چونکی رەخنەگر ب جهناڤێ خوه ڤەدگێڕت، وەکو پەیڤین ل گەل قارەمـانێ چیرۆکێ جهناڤێ دووێ ب کار دئینت.

د ئاڤاکرنا پشکا یەکێدا ژ دەقی رەخنەگر شـیایه ریتمـەکا گـشتی بـۆ دەقـی درست دکەت، ئەو ژی ب رێیـا دووبارەکرنـا (بـەفرە... بـەفر) بـۆ سـێ جـاران ل بەراهییا هەر بنیاتەکی ب رەنگەکێ ستوونی، دبت وی ئەڤ چەندە وەکو ئیحاو مفا ژ دووبارەکرنا دەربڕینا (سپی سپی وەکو چۆڕی شیر.. خـاو خـاو وەکـو لۆکـەی... هتد) بۆ سێ جاران د دەقێ چیرۆکێدا وەرگرتبـت، لـەورا وی ئـەڤ چـەندە د دەقـێ خوەدا ئەنجام دایه و دەقێ خوه ل سەر سێ بنیاتێن سەرەکی ئاڤاکریه. هـەروەها د درێژییا دەقیدا مفا ژ دیاردەیا ریتمێ دیتییه و ئەڤ چەندە ب رەنگەکێ ئاسـۆیی د دەربڕینێن ویدا خویایه، دیاره ئەڤ چەندە دەربڕینێ ژ داکۆکییێ ل وی تشتێ هاتییه دووبارەکرن ل نك وی دکەت، وەکو د ڤان نموونەیاندا بەرچاڤ دبت:

- "پـیرەداك پـڕ چـنگێکی مـابوو، بـیٚ هـۆش، بـیٚ هەسـت، بـیٚ چـاو، لێـی کەوتبوو"[٤٠].

دیارە پەیڤا (بیٚ) سیٚ جاران هاتییە دووبارەکرن.

١٨٩٨- " پیرەداك هەر لە داوای خۆی نەهاتە خواریٚ و .. نەهاتە خواریٚ، چل رۆژ ... چل شەو.. رۆژی چل جار ئەو تراژیدیایە وەك خـۆی دووبـارە دەبووەوە"[٤١].

رستەیا (نەهاتە خواریٚ) دوو جاران دووبارە بوویە.

پەیڤا (چل) سیٚ جاران دووبارە بوویە.

پەیڤا (خۆی) دوو جاران دووبارە بوویە.

پەیڤا (رۆژ) دوو جاران دووبارە بوویە.

ئەڤ دەقە ژ ئالییێ سیمانتیکی ژیڤە زەنگینە، چەندین هونەر تێـدا هاتینـە ب کارئینان، بۆ نموونە رەخنەگری هەڤدەقی د دەقیٚ خوەدا ب کارئینایە، یەکـەم جـار دەقیٚ رەخنەیی هەڤدەقە ل گەل دەقـیٚ چـیرۆکیٚ دەمـیٚ رەخنــەگر راسـتەوخۆ ڤـیٚ دەستەواژەییٚ (سپی سپی وەك چوٚڕی شیر.. خـاو خـاو... هتـد) ژ چـیرۆکیٚ د نـاڤ دەقیٚ خوەدا ب کارد ئینت، یان ژی دەمیٚ دەقیٚ چیرۆکیٚ بوویە بنیات بۆ ئاڤاکرنـا دەقیٚ رەخنەیی. دیسان ل جهـەکیٚ دی هەڤـدەقی ل گـەل گۆتنـا ب نـاڤ و دەنگـا (یولیۆس سیزار)ی ل دەمـیٚ کوشـتنا وی دبێـژت: ( پرۆتـۆس تـۆش)، کـو دەردیٚ قارەمانی بەرانبەر ییٚ (یولیۆس سـیزار)ی دبینـت ، لـەورا دبێـژت: "وەلیٚ سـەرم سوڕما چۆن تەنانـەت لـە دوا ساتانەشـدا بـە رووی ئـەو دلبـەرە سـارد و سـڕەدا هەڵنەشاخایت و نەت وت: (.. تۆیش.. بەفرەکە تۆیش؟! )"[٤٢] ، دیارە رەخنەگری ( بەفر) ب ( پرۆتۆس)ی لێکچواندییە.

دیسان ڕەخنەگری چیرۆکەکا دی ل گەل دەقێ خوە تێکەل کرییە، کو چیرۆکا (پەلاس) رووداناکا ریالیستی ل بیرا ڕەخنەگری ئینایە و ل ڤێرێ ڕەخنەگری تەکنیکا ( ڤەگێڕان ب تەداعی) ب کارئینایە، ب ڤێ چەندێ چیرۆکا ریالیستی ب زمانەکێ هونەری کاریگەر داڕژتییە، ڤێ جارێ قارەمانێ چیرۆکا (پەلاس) ب قارەمانا چیرۆکا ریالیستی و بەفر ب پیرە کراسێ کوڕێ وێ لێکچوواندییە، ئانکو دیمەنێ مرنا قارەمانێ چیرۆکا (پەلاس) بەرانبەر بەفرێ و گرتنا چاڤێن خوە ل سەر دیمەنێ داویێ یێ بەفرێ بەرانبەری قارەمانا چیرۆکا ریالیستی ( پیرەداك) دەمێ بۆ ماوەیەکێ درێژ سەکەراتا مرنێ دکێشت چاڤەڕێی کوڕێ خوە دکەت هەتا کراسێ کوڕێ وێ نێزیکی هەناسا وێ دکەن ژ نوو ئەمانەتێ خوە تەسلیم دکەت، ب ڤێ چەندێ ڕەخنەگری دوو دیمەنێن کاریگەر بەرانبەری یەك دکەت و لێکچوواندنەکا ڤەشارتی ل سەر ئاستێ دەقی درست دکەت. دیسان ئەڤ دەقێ ڕەخنەیی چەندین لادانێن سیمانتیکی ب خوەڤە دگرت وەکو:

-" دەست لە داوێنی ژیان بەریدا"[٤٣].

د دەربڕینا (داوێنی ژیان) دا لادانەك دهێتە دیتن، ئەو ژی داوێن بۆ ژیانێ هاتییە ب کارئینان کو ب راستی بۆ کراسی دهێتە ب کارئینان، ئانکو ژیان ب کراسی هاتییە لێکچوواندن، ب ڤێ چەندێ خواستنەکا ڤەشارتی دورست کرییە، کو تێدا (ژیان) بۆ خواستییە و (کراس) ژێ خواستییە و(داوێن) خواستییە، چونکی ژێ خواستی نە دیارە، تنێ سیفەتا وی دایە بۆخواستی ، لەورا جۆرێ خواستنێ ڤەشارتییە.

-"پەلاماری پیرەکراسی دا و هەلیگۆلۆفت "[٤٤].

ل ڤێرێ ڕەخنەگری ساخلەتا (پیر) بۆ کراسی خواستییە، ب راستی پیری بۆ مرۆڤان دهێتە گۆتن، لێ ل ڤێرێ بۆ کراسی هاتییە گۆتن، ئەڤەژی لادانەکا سیمانتیکییە،

کراس ب مرۆڤی لێك چوواندییه، لەورا ژی خواستنەکا ڤەشارتی دورست بوویە کو تێدا (کراس) بۆ خواستییە، (مرۆڤ) ژێ خواستییە، (پیر) خواستییە.

-" مرۆڤێکی کەم ئەزموون و (ژن دڵ)یش نیم"(٤٥)

دەربڕینا ( ژن دڵ) د ڤێ نموونەیێدا بۆ ساخلەتێ دلنازکییێ هاتییە، ئانکو دڕکەیە ل هەڤالناڤی.

-"بەلاّم بم بەخشە، فرمێسکم بۆ نەرشتی، پیرە داك زووتر هاتە دەست و ئەو دەنکە مروارییە دەگمەنانەی لە چاو دەرهێنام"(٤٦)

د ڤێ نموونەییێدا فرمێسك ب مرواری هاتییە لێکچوواندن، چونکی ئامرازێ لێکچوواندنێ ب کار نەهاتییە لێ رووێ لێکچوونێ ( دەگمەن)ە، لەوما لێکچوواندنەکا جەختکری درست کریە.

ژ ڤێ پێشچاڤکرنێ بۆ مە خویا دبت کو ئەڤ دەقە بوویە دەقەکێ ئەدەبی و پڕی سیماییێن شعرییەتێیە وەکو: ئاڤاهییێ وی و تەکنیکێن ئەدەبی و ریتم و لادانێن سینتاکسی و سیمانتیکی. ب ڤێ چەندێ ئەم دشێین بێژین ئەڤە یەکەم دەقێ رەخنەییە ل دوڤ مێژوویا وی- د سنۆرێ ڤەکۆلینا مەدا- ژ زمانێ رەخنەیێ دەرباز ببت و دەقەکێ هونەری ئاڤا کربت.

**٢-٢- دەمێ پەیام دەربڕینێن بەربەلاڤێن ئەدەبی ب خوەڤە دگرت:**

مەبەستا ل ڤێرێ ئەوە کو زمانێ پەیامێ ئەرکێن جودا ب جە دئینت و ژ وان ئەرکێ شعرییەتێیە، ئانکو د درێژییا ڤەکولینێدا ل هندەك جهێن بەلاڤ تێدا زمان بۆ خوە، بۆ ئازراندنا جوانکارییێ ب کار دهێت، ب راستی رێژەیا ڤێ چەندێ ژ کتێبەکێ بۆ یەکا دی، دیسان ژ ڤەکۆلینەکێ بۆ یەکا دی، جودایە، چونکی پترییا ڤان کتێبان ڤەکۆلینێن رەخنەیی یێن هەمەجۆر هەمبێز کرینە، بۆ نموونە ئەڤ چەندە د ڤان کتێباندا خویا دبت (بینای هونەری لە کورتە چیرۆکی کوردیدا

١٩٧٠-١٩٨٠)، ( بياڤێ خواندنێ)، ( وەغەرەك د نهێنییێن دەڤیدا)، ( پەیڤێن بێ پەردە)، (چیرۆکی هونەریی کوردی ١٩٢٥/١٩٦٠)، (لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩) د هەردوو کتێبێن یەکەمدا ئەڤ چەندە پتر بەرچاڤ دکەڤت .

ب جهئینانا ئەرکێ شعرییەتێ پتر ب رێیا لادانێن سیمانتیکی ب جه دهێت، کو ژ ئافراندن و شارەزاییا رەخنەگرینە، وەکو د ڤان نموونەیاندا دیار دبت:

- رەخنەگر (جەلال مستەفا) دبێژت: " دەڤێن مە بێ دەنگ دبۆرن. نڤیسەرێ کورد- تایبەتی چیرۆکنڤیس وەکی ژەنینا ئاوازەکێ جەنائیزی ب تەحلاتیڤە دبێژن. بێ دەنگی.. چوونا ل دویڤ تەرمی یە بۆ جهەکێ بێ دەنگتر"[٤٧]

ب گشتی ئەڤ رستەیە دەربڕینەکا نە راستەوخۆ دورست دکەن و وێنەیەکێ ئالۆز ئامادە دکەن، چونکی ژ رستەیێن پێکڤەگرێدای پێکدهێت. ژ ئالییێ پێکهاتنێڤە رستەیا یەکێ تەمامە، بەلێ رستەیا دووێ ( نڤیسەرێ کورد- ب تایبەتی چیرۆکنڤیس — وەکی ژەنینا ئاوازەکێ جەنائیزی ب تەحلاتیڤە دبێژن )یە، تێدا رەخنەگر رستەیا راگر( ب تایبەتی چیرۆکنڤیس) بۆ مەرەما تایبەتکرنێ تێدا زێدە کرییە. د رستەیا سییێدا ( بێ دەنگی.. چوونا ل دویڤ تەرمی یە بۆ جهەکێ بێ دەنگتر) گرێدان ل گەل رستەیا یەکێ ژ ئالییێ پێکهاتنێ و واتاییێڤە، چونکی ئەگەر رستەیا یەکێ نەبت واتایا رستەیا سییێ شێلی دبت، لەورا (بێ دەنگی) ژ رستەیا یەکێ دووبارە کرییە ل گەل رستەیا سییێ، ئانکو رستەیا سییێ پێدڤییە ب ڤی رەنگی بت (بێ دەنگییا بۆرینا دەڤان چوونا ل دویڤ تەرمی یە بۆ جهەکێ بێ دەنگتر) و ل ڤێرێ (بۆرینا دەڤان) ژ رستەیا یەکێ لابرییە، ب تنێ (بێ دەنگی) هێلایە، دبت چونکی مەرەما وی ئەو بت هەر بێ دەنگییەکێ ب ڤی رەنگی سالۆخ بدەت. ژ ئالییێ سیمانتیکیڤە وێنەیەك د هزرا مەدا درست کرییە و لێکچوونەك

وێنەیی د ناڤبەرا بۆرینا دەقی ب بێ دەنگی ب بۆرینا تەرمی درست کرییە، هەروەها ئاخفتنا نڤیسەرێ کورد ب ژەنینا ئاوازەکێ جەنائزی لێکچوواندییە.

- رەخنەگر (ئەحلام مەنسوور) دەمێ باسێ چیرۆکنڤیس (عەبدولڵا سەراج)ی و چیرۆکا وی ( ئاوێنە) دکەت دبێژت: " هەڵبەت ئامانجی سەرەکی نووسەر و گەشتەکەی پاڵەوانی ئاوێنە دۆزینەوە و رۆچوونە بۆ نێو برینە قووڵ و ژێر پێست و ئێسکەکانی کۆمەڵگا"(٤٨). د ڤێ نموونەییێدا لادانا سیمانتیکی د( برینە قووڵ و ژێر پێست و ئێسکەکانی کۆمەڵگا) دا درست بوویە، چونکی کۆمەلێ پێست و ئێسك نینن، بەلکو ئەڤە بۆ مرۆڤی دزڤرن، لەوما کۆمەل ب مرۆڤی لێکچوواندییە و خواستنەکا ڤەشارتی درست کرییە.

- رەخنەگر ( عەبدولخالق سولتان) دبێژت: " چەندین کەلەخا خلفێن سێدارا ماچی کرینە یان پێلێن ئاگری ب خوەڤە هەمبێز کرینە"(٤٩).

د ڤێ نموونەییێدا چوار لادانێن سیمانتیکی پێشچاڤ دکەڤن، یا یەکێ د ناڤبەرا کارای و کاریدایە، ئانکو پالڤەدانا کریارا ماچیکرنێ بۆ کەلەخان، چونکی ئەڤ کریارە ب تنێ کەسێ ساخ ئەنجام ددەت و کەلەخ د مرینە، لەوما کەلەخ ب کەسێ ساخ هاتییە لێکچواندن و خواستنەکا ڤەشارتی دورست بوویە. لادانا دی د ناڤبەرا بەرکاری و کاریدایەو ل ڤێرێ ماچیکرن کریارەکە دەربڕینێ ژ دلۆڤانییێ بۆ کەسێ مرۆڤ حەز ژێ دکەت دهێتە کرن، ل ڤێرێ بۆ سێدارێ هاتییە، دیارە کەس حەز ژ سێدارێ ناکەت، لەورا دڕکەیەك دورست دبت کو ل هەڤاڵناڤییە، ئانکو ب ڤیان و حەز کریارا ماچیکرنێ دهێتە کرن، هەروەها لادانا سیێ ب هەمان شێوەیێ یەکێ د ناڤبەرا کارای و کاریدایە، هەمبێزکرنا کەلەخان بۆ پێلێن ئاگری، دیسان ساخ ب ڤێ کریارێ رادبن، ئانکو خواستنەکا ڤەشارتی ل ڤێرێ دهێتە دیتنن هەروەها ئەڤ هەمبێزکرنە بۆ پێلێن ئاگری ب کار ئینایە و کەس پێلێن ئاگری

هەمبێز ناکەت، لەورا لادانەکا چـوارێ ل ڤێـرێ روو ددەت و درکەیـەکێ دورسـت دکەت، کو دیسان دەربڕینە ژ سـاخلەتێ ب حـەز ئەنجامـدانا کریـارا هـەمبێزکرنا پێلێن ئاگری، ئانکو ساخلەتێ قوربانیدانێ .

هندەك جاران ئـەڤ دەربـڕینێن نـە راسـتەوخۆ ئاسـایی و ئاشـنانە د ئاخفتنـا رۆژانەدا ب کار دهێن یان ژی رەخنەگری ژ گۆتنێن مەزنان وەرگرتینە، ئانکو نە ژ ئافراندنا وینە، ل دۆر وان جۆرە نموونـەیان (ریـچاردز) دیـار دکـەت کـو "هنـدەك خواستن مرینە، وەکو ( پێییێن مێزێ) یان ژ بەر هندێ کو ب لەز ل سەر ئـەزمان و قەلەمان بەلاڤ بووینە یان ژی روویێ لێکچوونێ د ناڤبەرا هەردوو ئالییاندا گەلـەك نێزیك و دیارە، کو کەسێ های ژ هندێ نامینت کو خواستن تێدا هەیە، یـان ژی ژ بەر هەردوو ئەگەران"(٥٠). دیارە مەبەستا نڤیسەری ل ڤێرێ خواستنێن بەربەلاڤن، بەلێ هەتا رادەیەکی ئەڤ گۆتنە د گەل ڤان جۆرێن نموونەیێن ئـەم بـاس ژێ دکـەین دگونجت، وەکو:

- دەمێ رەخنەگر (ئەحلام مەنسوور) وەسفا کەسـێ چـیرۆکا (سـەید کەلـەك) یـا (جەمال بابان)ی دکت، دبێژت: "گورگێکە لە پێستی مەڕ دایـە"(٥١)، دیـارە ئـەڤ گۆتنە دەربڕینەکا بەربەلاڤە و دبتە درکە ل هەڤالناڤێ فێلبازیێ.

ئەڤ جۆرە نموونە پتر د کتێبێن مە بۆ تـەوەرێ یەکێـدا دەستنیـشان کـرین، ئـانکو ئەوێن ئەرکێ هەلچوونێ تێدا زال پێشچاڤ دکەڤن، وەکو ل نك (عومەر مـەعرووف بەرزنجی) دەمـێ دبێـژت: " چـرای ئومێـدی کوژایـەوە"(٥٢) یـان "گـوڵی ژیـانی هەڵوەری"(٥٣) یان دەمێ دبێژت: " لەم قۆناخـەدا بابـەتی ئـەوتۆ خراونەتـە بـەر چاو... بە تۆزی پێی ئـەو بابەتانـەدا ناگـات کـە لـە سـەردەمی گەلاوێـژدا بڵـاو کراونەتەوە"(٥٤).

ژ ڤێ پێش چاڤکرنێ ئەم دگەهینە وی ئەنجامی کو ب جهئینانا ئەرکێ شعرییەتێ د زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردیدا ب دوو ئاوایان بوو، یەکەم: ئاڤاکرنا دەقەکێ نوو ل سەر بنەماییێ دەقێ رەخنە لێ دهێت گرتن، ئانکو زالبوونا شعرییەتێ ، ئەڤ چەندە ب تنێ د دوو بابەتێن کورتدا دهێتە دیتن، دەستپێك دڤی واریدا بۆ ( زاهیر رۆژبەیانی) دزڤرت، دووەم ب کارئینانا دەربڕینێن بەربەلاڤێن ئەدەبی د ناڤ زمانێ رەخنەییێدا، ئەڤ چەندە ژی ب دوو شێوەیان بوو، ئانکو پترییا وان دەربڕینان ژ ئافراندنا رەخنەگری ب خوە بوویە ب رێیا لادانێن سیمانتیکی هاتییە ئەنجامدان.

رێژەیا وان کتێبێن شعرییەت تێدا زال بووی یان هەتا رادەیەکی هەڤسەنگ دگەل ئەرکێن دی ب کارئینایین( ٢٣٪) یە، دیارە رێژەیەکا کێمە، دبت ئەگەرێ ڤێ کێماتییێ ژی دزڤرتە هندێ کو ئەم باسێ زمانێ رەخنەیا چیرۆکێ دکەین، نەك یێ شعرێ، ئانکو زمانێ چیرۆکێ ب گشتی ناگەهتە ئاستێ زمانێ شعرێ، هەرچەندە کورتە چیرۆکا هونەری نێزیکترین ژانرە بۆ شعرێ، کورتە چیرۆك فۆرمەکێ گەلەك تایبەتمەند و هونەرییە پتر نێزیکی شعرێیە"(٥٥)، هەروەها ل ڤێرێ ئەم باسێ زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی دکەین و گەلەك ژ وان ڤەکۆلینان ل دۆر چیرۆکا کوردییا دەستپێکێنە و وەکو ئەم دزانین دیسان ژ باسکرن و هەلسەنگاندنا ڤان ڤەکۆلینان ب خوە ژی خویا دبت، کو زمانێ وان چیرۆکان زمانەکێ ئاساییە و هەتا رادەیەکی سادە و ساکارە، لەوما دبت ئەڤە ئەگەرەك بت شعرییەت د ناڤ زمانێ رەخنەیا واندا کێم بت، چونکی بێ گومان دێ کاریگەرییا رەخنەگری ب زمانێ وان کێمتر بت ژ هندێ هەکەر زمانەکێ ئەدەبییێ ب هێز بت.

### ٣- زمان و بجهئينانا ئەركێ تێگەهاندنێ:

ئەڤ ئەركە ب جهـ دئێت دەمێ داكۆكی ل پەیامو‌ەرگری دهێتە كرن، ئەگەر ل دوڤ سیماییێن (یاكوبسن)ی بۆ ڤی ئەركی خویا كرین كو جهناڤێ دووێ و ب كارئینانا دارشتنا فەرمان و گازیكرنێ بوویە ل ڤی ئەركی بگەرین بۆ مە خویا دبت، كو ب كارئینانا جهناڤێ دووێ وەكو داكۆكی ل پەیامو‌ەرگری گەلەك كێم دهێتە دیتن و ل جهێن بەلاڤ بۆ ئاماژەییێن گەلەك كێم پێشچاڤ دكەڤت، وەكو د ڤان نموونەیاندا دیار دبت:

- هندەك جاران رستەیا (دێ بینی) دهێتە دیتن، بەلێ د ئاستەكێ گەلەك كێمدا وەكو د كتێبا (پەیڤێن بێ پەردە) دا، كو ل شەش جهان د لاپەرێن (٢٩، ٣٠، ٣١، ٣٢، ١١٨) دووبارە بوویە، هەروەها د كتێبا ( وەغەرەك د نهێنییێن دەقیدا) یەك جارێ د لاپەرە (١٥٣) دا هاتییە.

- دەربرینا (سەرنجتان رادەكێشم) د كتێبا ( چیرۆكی هونەریی كوردی ١٩٢٥-١٩٦٠) د لاپەرە (٨٥، ٩٨، ١٥٨) دا دهێتە دیتن، ب راستی ئەڤ دەربرینێن هە، وەسا دیارن پتر بۆ ئاگەهداركرنا پەیامهنێری هاتینە ژ هندێ كو بۆ تێگەهاندنا وی بن.

ل دۆر دارژتنا فەرمانی، دیسان ل كت كتێن جهان و د كت كتێن كتێباندا دهێتە دیتن وەكو:

- د كتێبا (لە ناو بازنەی دەقدا) هاتییە : " بڕوانە چ ڕۆڵێكی ئەفسانەیی پیرۆزی پێ بەخشراوە"[٥٦]، یان دەمێ دبێژت: " تو دیقەت بگرە"[٥٧].

- د كتێبا (كامەران موكریی چیرۆكنووس) دا دهێت "سەرنجێك ئەم وەسفەی تری بدە، بزانە بە بەر چاوتەوە ماڵی مام حەسەن نا سووتێ"[٥٨]، دیسان تێدا دهێت "سەرنجی ئەم وێنەیەش بدە"[٥٩].

ب ڕاستی ئەڤ چەندە کێم دهێتە دیتن و ب ڤێ چـەندێ بـۆ مـە خویـا دبـت کـو داکۆکیکرن ل پەیاموەرگری ل ئاستەکی گەلەك نزم دابوویە، لەورا ل ڤێرێ پێدڤییـە ئەرك و تایبەتمەندییا زمانێ رەخنەیێ نەهێتە ژ بیرکرن و ل بەرچاڤ بهێتە وەرگرتن، زمانێ رەخنەیێ میتا زمانە، زمانێ شلوڤەکرن و سالۆخدانێیە ل دۆر زمانەکێ دی کو دەقێ ئەدەبییە، ب ڤێ چەندێ پێدڤییە رەخنە ئاماژە بت بۆ وی دەقی، ئـانکو زمان دبتە هێما — ل دوڤ چەمکێ (ریچاردز)ی- بـۆ دەقـێ ئـەدەبی و ب رۆنـی و ئاشکەرایی دەقی پێشچاڤ دکەت، ب ڤێ چەندێ ئەرکێ لێ ڤەگەر ب جھ دئینـت، بەلێ ئەڤ چەندە بۆ پەیاموەرگرەکی دهێتە ئەنجامدان ئانکو شرۆڤەکرن و رۆنکرن بۆ پـەیاموەرگری ئاراسـتەکرییە کـو ئـەو ژی سـێنە، نڤیـسەرێ دەقـێ ئـەدەبی، خوێندەڤانێ ئاسایی، رەخنەگرێن دی، ب ڤێ چەندێ تێگەهاندنا دهێتە ئەنجامـدان پتر ژ وێ رەخنەیا کو هەڵچوون یان شعرییەت تێدا زاڵ بت، بەلێ دیـسان زاڵبوونـا وێ تێگەهاندنێ ئارێشەیێن خوە هەنە "دەقێ رەخنەیی هەژار دکت و نێزیك دبت ژ ناڤەرۆکا وییا جوانکارییێ یا کو بنیات بـۆ پێکهاتنـا وی ڤـالا بکـت"[٦٠]. چـەند بەرهەمەکێن رەخنەیا هونـەرییا کـوردی د ڤـی بواریـدا هەنـە، بـەلێ ب راسـتی نەگەهشتینە ڤی ئاستی، بەلێ ئەڤ بەرهەمە پتر ب زمانەکێ هێمایان، ئانکو وەکو ئاماژەکرن بۆ دەقێ ئەدەبی، شرۆڤەکرن و رۆنکرنا وی ب جھ دئینت و پتر زمانەکێ بابەتی ، راستەوخۆ و زانستی هاتینە نڤیسین و ئەرکێ لێ ڤەگەر تێدا زالـە، بـەلێ یێ هەڵچوونێ و شعرییەتێ د پلەیەکا گەلەك نزمدایە، هەرچەندە ئەڤە ژ کتێبەکێ بۆ یەکا دی جودایە، بەلێ ب گشتی زمان تێدا بوویە ئاماژە بۆ دەقی و رەخنەگری ڤیایە تێدا دەقی بۆ پەیاموەرگری رۆن و ئاشکەرا بکـەت، ب ڤـێ چـەندێ ئـەرکێ

تێگەهاندنا پەیاموەرگری ب جھ ئینایە، بۆ نموونە ئەڤ چەندە د ڤان کتێباندا دهێتە دیتن ( بینای هونەری چیرۆکی هونەری کوردی لـە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی جـەنگی دووەمی جیهانی)، ( تـەکنیکی گێڕانـەوە لـە چـیرۆکەکانی مـارف بـەرزنجی دا)، (تەکنیکا ڤەگێڕانێ د کورتە چیرۆکێن فازل عومەری دا)، ئانکو زمان ل ڤێرێ پـتر راستەوخۆیە و دوورە ژ هەڵچوونێ و شـعرییەتێ و زمـان تێـدا بوویـە ئـامراز بـۆ تێگەهاندنێ. ئەگەر ئەم رێژا ئەرکێ تێگەهاندنێ ب گشتی بـۆ کتێبـێن رەخنـەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی خویا بکەین نێزیکی (٢٣٪)یە .

پشتی ڤێ چەندێ بۆ مە خویا دبت کو هەتا ڕادەیەکی زمانێ رەخنەیا چـیرۆکا هونەرییا کوردی هەمـەجۆرە ، ئـانکو هـەموو ئـەرك تێـدا بەرچـاڤن ، بـەلێ ب رێژەیەکا پتر کەسایەتییا رەخنەگری پتر جهێ خوە کرییە و بۆچوونێن خوە پێش چاڤ کرینە، ئانکو ئەرکێ هەڵچوونێ د زمانیدا ب جھ ئینایە.

### ئەنجام:

- ناڤونیشانێن کتێبێن رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردی ژ سیمایێ ناڤکرنێ لانەداییـە، ئانکو ب گرێبێن ناڤی هاتینە ناڤکرن.

- ناڤونیشانێن کتێبێن رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کـوردی ب سـەر دوو جۆرانـدا پارڤـە دبن: ناڤونیشانێن ب زمانەکێ راستەوخۆ و بابەتی هاتینە نڤیسین، رێژەیا وان پترە، بەلێ هەموو د یەك ئاستدا نیـنن، ئـانکو هنـدەك پـتر بابـەتی و سـنووردارن و هنـدەك دی گشتینە، جۆرێ دووێ ئەوێن ب زمانەکێ هونەری و هێمـایی هاتینـە نڤیـسین. ئـانکو ئەرکێ تێگەهاندنێ و شعرییەتێ دابین کرییە، بەلێ بێ هەڵچوونێ پێشچاڤ ناکەڤت.

- ناڤونیشانێن هونەری ژ ئالییێ رەخنەگرێن چیرۆکنڤیسڤە هاتینە ب کارئینان، ئاماژەنە بۆ جۆر و شێوەیێ رێباز و میتۆدێن رەخنەیی، نەکو بۆ بابەت و ناڤەرۆکا کتێبێ.

- د زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردیدا داکۆکیکرن ل پەیامهنێری پتر زاڵە، ئانکو ئەرکێ هەڵچوونێ پتر جهێ خوە کرییە، ئەڤ چەندە ژ زمانێ هەڵسەنگاندنێ و چەند سیماییێن گشتییێن زمانێ رەخنەییێ خویا دبت، وەکو: دەربڕین ب جهناڤێ ئاخڤتنکەر ، داڕژتنا حێبەتی و سەرسۆڕمانێ، دەربڕینا پەیامهنێری ژ خەمباری و مخابنییا خوە بەرانبەر هەلوێست و ئالییێن دەقی، دەربڕینا وی ژ هەست و کاریگەرییا خوە، ب کارئینانا زمانەکێ سۆزدار. ئانکو پتر ئەرکێ هەڵچوون و دەربڕینێ جهێ خوە کرییە.

- داکۆکیکرن ل پەیامێ ژی هەتا رادەیەکی د زمانێ رەخنەییێدا دیارە، بەلێ ب رێژەیەکا کێمتر، ئەوژی ب دوو شێوەیان: دەمێ پەیام دەقەکێ نوو ل سەر بنەمایێ دەقێ ئەدەبی ئاڤا دکەت، ئەڤەژی گەلەك کێمە و ب رەنگەکێ بەرچاڤ د یەك بابەتدا دهێتە دیتن، ئەوژی (پەلاس بە لایەنگیری یەوە) یا (زاهیر رۆژبەیانی)یە، کو چەند سیماییێن شعرییەتێ ژ ئالییێ پێکهاتن و ریتم و لادانێن سینتاکسی و سیمانتیکیڤە و تەکنیك، تێدا دهێنە دیتن، شێوەیێ دووێ ب کارئینانا دەربڕینێن ئەدەبی ب رەنگەکێ بەربەلاڤ د درێژییا ڤەکۆلینا رەخنەییدا، چ ژ داهێنانا رەخنەگری بن یان یێن بەلاڤ و ژ گۆتنێن مەزنان بن، ئەڤ جۆرەژی پتر ب لادانێن سیمانتیکی هاتینە درستکرن. ب ڤێ چەندێ ئەرکێ شعرییەتێ تێدا بەرچاڤە.

- داکۆکیکرن ل پەیام وەرگری و ب جهـ ئینانا ئەرکێ تێگەهاندنێ، د زمانێ رەخنەیا چیرۆکا هونەرییا کوردیدا، د ئاستەکێ کێمتردایە ژ پەیامهنێری و پەیامێ.

## ژێدەر و پەراوێز:

١– أسماء صالح الزهراني. "(٢٠٠٦ ) اللغة والممارسة المجانية للنقد"، مج( ديوان العرب)، الأثنين ١٤ آب (آغسطس). www.diwanalarab.com

٢- بنێڕە: اء. ا. رتشاردز .( ١٩٦٣) مبادىء النقد الادبي ، ترجمة وتقديم : د. مصطفى بدوي ، مراجعة : د. لويس عوض، المؤسسة المصرية العامة للتاليف والترجمة والطباعة والنشر، مطبعة مصر، القاهرة. ص٣٣٩.

(*) ميتا زمان ئەو زمانەیە ئەوێ گەنگەشێ ل دۆر زمانەکێ دی یان خوە دکەت . بنێڕە: د. سعيد علوش. معجم المصطلحات الادبية المعاصرة . ص١٩٩.

٣– طائفة من الأساتذة والمتخصصين.( ١٩٧٧) حاضر النقد الأدبي، ترجمة : د. محمود الربيعي، ط٢، دار المعارف بمصر، القاهرة. ص١٣٢.

٤– هەمان ژێدەر، ل٤٥.

٥– رومان ياكوبسن. (١٩٨٦) قضايا شعرية، ت: محمد الولي و مبارك حنون، ط١، دار توبقال للنشر، الدار البيضاء. ص٣٣.

٦ – أسماء صالح الزهراني." اللغة والممارسة المجانية للنقد"، مج (ديوان العرب).

٧– بنێره : د. عبد السلام المسدي. (١٩٨٣) النقد والحداثة، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت. ص٢١.

٨– اسماء صالح الزهراني."اللغة والممارسة المجانية للنقد"، مج( ديوان العرب).

٩– د. سمير سعيد حجازي. (٢٠٠٤) اشكالية المنهج في النقد العربي المعاصر، دار طيبة للنشر والتوزيع والتجهيزات العلمية، مطابع دار الهندسة، القاهرة. ص١٠٣.

١٠ – بەختيار سەجادی. (٢٠٠٤) " قەڵشتی نێوان رەخنەی ئەدەبیی سونەتی مۆدێرنی کوردی"، گ(شین)، ژ(٤)، ل٨٥.

١١– هەمان ژێدەر و لاپەڕە .

١٢– ضون كوين، ( ٢٠٠٠) النظرية الشعرية ، ترجمة: د. احمد درويش، دار الغريب للطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة. ص١٩١.

١٣ – د. جميل حمداوي. ( ١٩٩٧) " السيميوطيقا والعنونة"، مج ( عالم الفكر) تصدر عن المجلس الوطني للثقافة و الفنون والآداب، دولة الكويت، المجلد الخامس والعشرون، ع(٣)، يناير/ مارس. ص ٩٧–٩٨.

١٤- د. جميل حمداوى. (٢٠٠٦)" صورة العنوان في الرواية العربية " ، ٥ آغسطس. موقع دروب http://www.doroob.com/?p=/0030.
١٥ – هەمان ژێدەر، ل١٠٠.
١٦- د. سوادي فرج مكلف. (٢٠٠٠) "نبوءة العراف قراءة في العنوان الفني للدراسة النقدية"، مج(الأقلام) ، دار الشؤون الثقافية العامة ، العراق، السنة الخامسة والثلاثون، ع(٦)، تشرين الثاني- كانون الاول، ص٣٧.
١٧- رەوف حەسەن. دەرزى ئاژنى خەمەكان، ل ٥.
١٨- نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد.( ٢٠٠١) شيعرييەتى دەق و هەنگوينى خوێندنەوە، چاپخانەى رەنج، سلێمانى، ل٤.
١٩- جلال مصطفى.( ٢٠٠٤) بياڤێ خواندنێ، چ ١، ژ وەشانێن ئێكەتيا نڤيسەرێن كورد- دهوك، چاپخانا هاوار، دهوك. ل١٠.
٢٠- هەمان ژێدەر، ل١١.
٢١- هەمان ژێدەر، ل١٦.
٢٢- عبدالخالق سلطان. ( ٢٠٠٥) پەيڤێن بێ پەردە، چ١، ژ وەشانێن ئێكەتيا نڤيسەرێن كورد- دهوك، چاپخانا هاوار، دهوك. ل ٢١.
٢٣- هەمان ژێدەر و لاپەڕە .
٢٤- بنێرە: د. سوادي فرج ملكف." نبوءة العراف قراءة في العنوان الفني للدراسة النقدية"مج(الأقلام)، ع(٦)، ٣٢-٣٣.
٢٥- عصام العسل. ثريا النص (قراءة في شعرية العنوان).
http://www.alsabaah.com/paper.php?source=akbar&mlf=copy&sid=3388.
٢٦- د.خالد حسين حسين .(٢٠٠٦)" القصة القصيرة .. و ظاهرة العنونة خطاب العناوين في سردية زكريا تامر نموذجا للقراءة" مج( الموقف الادبي)، مجلة شهرية تصدر عن اتحاد كتاب العرب بدمشق، ع (٤٢٢) حزيران.
http://www.awu - dam. org/ mokifadaby/ 422/ mokf422. 007. htm
٢٧-حسين عارف . (١٩٧٧) چیرۆكی هونەریی كوردى ١٩٢٥-١٩٦٠ ، چ١، دار الحرية للطباعة، بغدا.ل ٣٧.
٢٨- صەباحى غالب . ( ١٩٧٩) ئافرەت لە چیرۆكی كوردیدا، دار الثقافة و النشر الكردية، دار الحرية للطباعة، بغداد. ل ٩٣-٩٤.
٢٩- هەمان ژێدەر، ل ٣١ .

٣٠- سەمەد ئەحمەد. (٢٠٠٣) لە ناو بازنەی دەقدا ، چ١، لـە بلاوكراوەكـانی وەزارەتـی رۆشنبیری - بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپ و بڵاوكردنەوە، سلێمانی. ل ١٦٢ .

٣١- حەمە سەعید حەسەن. ( ٢٠٠٥) هزر و شێواز لە چـیرۆكی كوردیـدا، چ١، دەزگـای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر. ل ٤٨.

٣٢- حەسـەن جـاف . (١٩٨٨) كامـەران مـوكریی چـیرۆكنووس، لـە چـاپكراوەكانی ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری لاوان، مطبعة سومر،. ل ٢٩-٣٠.

٣٣- محمد عزام. (١٩٩٤) التحليل الالسني للادب، منشورات وزارة الثقافة، دمشق. ص ١٤٤.

٣٤- بنێرە: د. سمير حجازي، ( ٢٠٠٤) مدخل الى مناهج النقد الادبي المعاصـر، ط١، دار التوفيق، سورية. ص٤٧-٤٨.

٣٥- صبيح محمد حسن، ( ٢٠٠٤) چەند رێیەك بۆ دەقی، ژ وەشانێن ئێكەتییا نڤیسەرێن كورد- دهوك، چاپخانا هاوار، دهوك . ل٩٢.

٣٦- هۆشەنگ شێخ محەمـەد. ( ب. س. چ) گوتـارێن رەخنـەیی، ژ وەشـانێن ئێكـەتییا نڤیسەرێن كورد- دهوك، چاپخانا هاوار، دهوك . ل٢٤.

٣٧- زاهیر رۆژبەیانی، ( ١٩٩٧) چیرۆكی هونەریی كـوردیی شـێوە و، شـێواز و بونیـاد، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری ، هەولێر. ل ٧٤.

٣٨- هەمان ژێدەر و لاپەڕ.

٣٩- هەمان ژێدەر ، ل٧٥.

٤٠ هەمان ژێدەر ، ل ٧٧.

٤١- هەمان ژێدەر و لاپەڕ.

٤٢-هەمان ژێدەر ، ل٧٦ .

٤٣- هەمان ژێدەر و لاپەڕ.

٤٤- هەمان ژێدەر ، ل ٧٧.

٤٥-هەمان ژێدەر و لاپەڕ .

٤٦- هەمان ژێدەر ، ل٧٨.

٤٧- جلال مصطفى. بیاڤێ خواندنێ، ل ٧٨.

٤٨- احلام منصور، ( ١٩٩٩) بینای هونەری لە كورتە چـیرۆكی كوردیـدا ١٩٧٠-١٩٨٠، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. ل ١٣٣.

٤٩ – عبدالخالق سلطان. پەیڤێن بێ پەردە، ل ٢٥.

٥٠ –د. احمد محمد ويس.( ٢٠٠٥) الانزياح من منظور الدراسات الاسلوبية، ط١، مجد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت.ص ١١٦.

٥١– احلام منصور. بیناى هونەرى لە کورتە چیرۆکى کوردیدا ١٩٧٠–١٩٨٠، ل ٤٥.

٥٢– عومەر مەعرووف بەرزنجى.( ١٩٧٨) لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیاى چیرۆکى کوردى، لە چاپکراوەکانى کۆڕى زانیارى کورد، چاپخانەى کۆڕى زانیارى کورد. ل ٥١.

٥٣– هەمان ژێدەر، ل٥٢.

٥٤– هەمان ژێدەر ،ل ٧٥.

٥٥– سوزان لوهافر. ( ١٩٩٠) الاعتراف بالقصة القصيرة، ترجمة: محمد نجيب لفتة، ط١، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد. ص٢٧.

٥٦–سەمەد ئەحمەد. لە ناو بازنەى دەقدا، ل ١٤٣.

٥٧– هەمان ژێدەر، ل ١٨٩.

٥٨– حەسەن جاف. کامەران موکریى چیرۆکنووس، ل ٣٠.

٥٩– هەمان ژێدەر، ل٣١.

٦٠–اسماء صالح الزهراني. " الممارسة المجانية للنقد" مج( ديوان العرب) www.diwanalarab.com

## الخلاصة

# خصوصية لغة النقد في القصة الكردية الفنية
## ١٩٧٣-٢٠٠٦

د. فؤاد رشيد محمد                    نفيسة اسماعيل حاجي

إنَ هذه الدراسة مقارنة نقدية للغة نقد القصة الفنية الكردية للفترة (١٩٧٣-٢٠٠٦)، إذ تقوم بعرض أهمَ سماتها وقضاياها وخصائصها حسب نظرية التواصل لرومان ياكوبسن، وتبحث في جوانب الحداثة التي ظهرت في لغة النقد، نتيجة إزالة الحدود بين لغة النقد ولغة النص. لقد تناولت هذه الدراسة الكتب النقدية التي ضمت بحوثاً ودراسات حول نقد القصة الفنية الكردية في كوردستان العراق في الفترة المحدَدة.

# Abstract

***Dr. Fu'ad R. Muhammad & Nafisa I. Haji (M.A)***

This research is a critical analysis of the language of criticism of the Kurdish short story during the period 1973-2006 It demonstrates its characteristics, and features. It also tries to study the modernity, which appears in the language of criticism as a result of removing borders between its language and the language of literary texts. This research has dealt with the critical books, which include researches and studies about the criticism of the Kurdish short story in Iraqi Kurdistan in that period. The study has tackled two important problems of the language of criticism of the Kurdish short story, i.e., the problems of terminology and critical judgment.

# زمان تێکەڵکردن لە ئاخاوتندا


**پ.د. محەمەد مەعرووف فەتاح**

بەشی ئینگلیزی

کۆلێژی زمان

زانکۆی سەلاحەددین

**د. سەباح ڕەشید قادر**

بەشی کوردی

کۆلێژی پەروەردەی مرۆڤایەتی

زانکۆی سەلاحەددین


## ناوەڕۆک

## ١- پێشەکی

تێکەڵکردنی زمان[*]، یان بازدان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، ئەم دیاردە زمانییە بە گەلێك هۆکار دێتە کایە، بەڵام دیارترین هۆکار کاتێك قسەکەر لە ئاست گەیاندنی مەبەستێك بە تاکە زمانێك دووچاری گرێ و تەگەرە دەبێ، ناچار پەنا دەباتە بەر زمانێکی هاوکار، کە تا ڕادەیەك شارەزایی لە بارەوە هەیە. ئەم دیاردە زمانییە دەچێتە ئاستی توانست و توانای قسەکەرەوە، لەوەی لە چ هەڵوێستێکدا بۆی دەرەخسێ تێکەڵکردنەکە ئەنجام بدات لە رووی ڕێکەوتنی دەنگی و گەیاندنی مەبەستەکە. بەدەر لە هۆکارەکانی دروستبوونی زمان گۆڕین، لە هەموو زمانەکاندا شوێنی تێکەڵبوونەکە وەکو یەك نییە. ئێمە لەو توێژینەوەیەدا هەوڵی دەرخستنی شوێنی تێکەڵبوون لە نێوان زمانی کوردی – عەرەبی لەلایەك و زمانی کوردی – تورکمانی لەلایەکی تر دەخەینە ڕوو، بەڵام بەهەر شێوەیەك بێ شوێنی تێکەڵکردنەکە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی ڕستەدا لەنگەر دەگرێ. ناوەڕۆکی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ( دە ) بەش پێکدێ: بەشی یەکەم بریتییە لە هەندێ تێبینی تیۆری سەبارەت بە دیاردەی زمان تێکەڵکردن، بەشی دووەم شیکردنەوەی دیاردەکەیە، لە بەشی سێیەمدا جۆرەکانی تێکەڵکردن خراوەتە ڕوو، بەشی چوارەم ئەرکەکانی تێکەڵکردن دەخاتە ڕوو، بەشی پێنجەم تایبەتییەکانی دیاردەکە دەناسێنێ، بەشی شەشەم دوو بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە دیاردەکە دەخاتە ڕوو، بەشی حەوتەم بریتییە لە خستنە ڕووی زمان

---

(*) لە زمانی ئینگلیـزی گـەلێك زاراوەی Code Switching, Code Shifting , Code Changing , جۆراوجۆری وەك ی بۆ بە کار هێنراوە.

تێکەڵکردن لە سنووری ئاخاوتندا، کەچی بەشی هەشتەم لە سنووری ڕستەدایە، بەشی نۆیەم شیکردنەوەیەکی مەسەلە تیۆرییەکانە، دوا بەش، کە بەشی دەیەمە بریتییە لەو ئەنجامانەی، کە لێکۆڵینەوەکە پێی گەیشتووە.

## ٢- دیاردەی زمان تێکەڵکردن: هەندێ تێبینی تیۆری

زۆرجار لە زۆر باردا قسەکەر تەنیا پێویستی بە واژە و ڕێزمانی یەك تاکە زمان دەبێت لە بەرهەمهێنانی گوتندا، بەڵام مەرج نییە هەمیشە هەموو گوتنەکانی لەم جۆرە بن و لە یەك تاکە زمانەوە سەرچاوە بگرێت. گوتنی وەها زۆرە کە کەرەسەکانی لە دوو زمان یان زیاترەوە هاتبن وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەبینرێن:

١) أريد غرفة زۆر گەورە. ( عەرەبی — کوردی )

٢) ئەو في الكولان. ( کوردی — عەرەبی )

٣) نازانم هەرە دوشتی. ( کوردی — تورکمانی )

ئەم جۆرە گوتنانە کە تێکەڵکردنی زمانیان تێدایە لە ژێر ناوی زمان تێکەڵکردن لە ساڵانی ١٩٧٠ وە لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان لە بارەوە کراوە، لە ڕوانگەی سایکۆ و سۆسیۆ و زمانەوانییەوە. سایکۆ هەوڵ دەدات ئەو لایەنەی توانستی زمان دیاری بکات کە توانای زمان تێکەڵکردن دەدات بە قسەکەر، سۆسیۆ دەیەوێت ئەو هۆکارانە بدۆزێتەوە کە پاڵ بە قسەکەرەوە دەنێ لە نێوان ڕێزمان و واژووی زماندا ئەمبەرو ئەوبەر بکات. زمانەوانیش دەیەوێت بزانێت ئەمە تێکەڵکردنی دوو زمانە یان تەنیا بەکارهێنانی کەرەسەی زمانێکە لەناو زمانێکی تردا. زۆربەی ئەوانەی لە دەرەوەی ئەم زانستانە سەیری کێشەکە دەکەن وای بۆ دەچن کە تێکەڵکردن لە خۆیدا نیشانەیەکی زمان

لاوازبوون و تێدا چوونەو لە ئەنجامی نەزانینی یەکێك لەو دوو زمانەیە کە قسەکەر تێکەڵیان دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا بەڵگە بۆ ئەم قسانە لە ئارادا نییە. تێکەڵکردنی زمان دیاردەیەکی دابڕاو نییە، بەڵکو دیاردەیەکی بڵاوە لە کۆمەڵە دوو زمانی و فرە زمانییدا.

**٣ – جۆرەکانی تێکەڵکردن:**

ئەوەندەی پەیوەندی بە تێکستەوە هەبێت سێ جۆر تێکەڵکردن لەیەکتری جیا دەکرێنەوە ( ١ ) تێکەڵکردنی لاوەکی وەك بەکارهێنانی نیشانەکانی ڕامان و سەرسوڕمانی زمانێك لە زمانێکی تردا وەك: واو ! کەی ؟ ( ئینگلیزی ـ کوردی ). ئەم کلکانە وەك زیادەن لە ڕستەدا و ڕەمزی کەسێکن کە یەك زمان دەزانن، هەر لەبەر ئەمەشە زۆر جار بە تێکەڵکردنی ڕەمزی ناو دەبرێن. ( ٢) تێکەڵکردنی ناوەکیی کە بەتایبەتی لە ناوەڕاستی گوتندا ڕوودەدات "ئەم جۆرەیە کە بەزۆری بە زمان تێکەڵکردن ناودەبرێ". ( ٣ ) تێکەڵکردن لەنێوان دوو گوتندا. شایانی تێبینییە ئەم سێ جۆرە هەموو کاتێك بە ئاسانی لەیەکتری جیا ناکرێنەوە.

**٤–ئەرکەکانی زمان تێکەڵکردن:**

زمان تێکەڵکردن بۆ ئەنجامدانی چەندین ئەرك بەکار دێ وەك:

**( ١ ) ئەرکی ئاماژەکردن:** ئەم ئەرکە کاتێك هەستی پێ دەکرێ کە قسەکەر لە یەکێك لەو دوو زمانەی تێکەڵیان دەکات شارەزایی کەمتر بێت و واژەکانی نازانێ و هانا بۆ زمانەکەی تر ببات کە شارەزاترە تێیداو واژەکانی زیاتر لەبەردەستدان. ئەم ئەرکەش پەیوەندی بە بابەتی قسەکردنەوە زۆرە "هەندێ بابەت لەوانەیە یەکسەر ببێتە هۆی تێکەڵکردنی دوو زمان، بەتایبەتی کە یەکێك لەزمانەکان پسپۆڕی لە بابەتەکەدا زیاتربێت" بۆ نموونە کە بەرشدی لە زمانەوانی دەدوێن لەوانەیە کوردی و

ئینگلیزی تێکەڵکردن ئاسایی بێت، "چونکە ئینگلیزی زاراوەی زیاترەو بڵاوترەو زیاتر لەبەردەستدایە " لەوانەشە لێرەدا زمان تێکەڵکردن پێویست بێت بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوە و تێگەیاندن.

بەم پێیە... هەموو ئەم زمان تێکەڵکردنانەی پەیوەندییان بە بابەتی ئاخاوتنەوە هەیە تێکەڵکردنەکە بە مەبەستی ئاماژەکردنە تێیاندا چونکە کەرەسە تێکەڵکراوەکان هەوڵن بۆ دەربڕینی بیرو پۆلینکردنی دەوروبەر.

**( ٢ ) ئەرکی ئاراستەکردن:** زمان تێکەڵکردن لێرەدا لە بەرژەوەندی بیستەر یان گوێگردا دەبێت. ئەرکی ئاراستەکردن چەند شێوەیەکی جیاوازو هەندێ جار دژ بەیەك وەردەگرێ. بۆ نموونە زمان تێکەڵکردن بەمەبەستی ئەوە دێت کە هەموو گوێگرەکان لە بابەتی ئاخاوتنەکە بگەن و بەشدارییان هەبێت. بە پێچەوانەشەوە، هەندێ جار تێکەڵکردنەکە بۆ ئەوەیە هەموو گوێ هەڵخەرێ، کە لەوێدایە لەبابەتەکە نەگەن و قسەکەر تەنیا یەك هەڵدەبژێرێ کە بە وردی لە بابەتەکە بگات " ئەم گوێگرە دەبێ شارەزایی لە هەردوو زمانەکەدا هەبێت و گوێ هەڵخەرانی تر وا چاوەڕوان دەکرێ لە کەرەسە تێکەڵکراوەکان نەگەن یان شارەزاییان لەم زمانەدا نەبێت. هەموو ئەو جۆرە تێکەڵکردنانەی پەیوەندییان بە هاوبەشەکانی قسەکردنەوە هەیە، قسەکەر یان گوێگر، لە جۆری ئاراستەکردنن.

**(٣) ئەرکی کەسایەتی دەربڕین:** لە ڕێگەی زمان تێکەڵکردنەوە هەندێ جار قسەکەر کەسایەتی تێکەڵی خۆی دەردەبڕێ، واتە زانینی خۆی لەو دوو زمانەدا یان ئەو ڕاستییەی کە لە ژینگەیەکەوە دێ کە هەردوو زمانەکە یان زمانە تێکەڵکراوەکە باڵایە تێیداو خاوەنی ناوبانگ و سەروەرییە و ئەم بە ڕێزەوە سەیری دەکات.

**(٤) ئەرکی کۆمەڵایەتی:** هەندێ جار زمان تێکەڵکردن بە مەبەستی گۆڕینی ئاوازە دێ لە ئاخاوتندا. ئەم جۆرە هەندێ جار بە تێکەڵکردنی میتافۆری ناو دەبرێ[1] کە تێیدا باری قسەکردن، واتە کات و شوێنی قسەکردنەکە تێکەڵکردنەکە دەسەپێنن وەك: منیش بە دەستی بەتاڵ گەڕامەوە بخفی حنین (کوردی – عەرەبی ). مەبەست لەم تێکەڵکردنە جێ خۆشکردن و نزیکبوونەوە و پاراستنی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لەبارە لە نێوان قسەکەر و گوێگرەکانیدا.

**(٥) ئەرکی مێتا زمانی:** ئەم ئەرکە کاتێك ئەنجام دەدرێ کە تێکەڵکردنەکە بەکاربێت بۆ لێدوان لە دوو زمانەکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ. نموونەیەك لەم جۆرە ئەرکە لەو کاتانەدا روو دەدات کە قسەکەر لە زمانێکەوە باز دەدات بۆ زمانێکی تر بۆ ئەوەی توانستی خۆی لە زمانێکدا نیشان بدات.

**(٦) ئەرکی جوانکاری:** زۆر جار ئەوانەی کە دوو زمان یان زیاتر دەزانن لەناو نوکتە و یاریکردن بە وشە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر باز دەدەن وەك لەم نموونەیەدا دەیبینین: بارام بەگی ئەحمەد بەگی ریشێن و شێخ عەلی شێخ کەریم ئەچنە لۆقەنتە. کابرای " بۆی " دێت ئەڵێ چی ئەخۆن ؟ بارام بەگ ئەڵێ: من برنج و شێخ مەحشی. (بۆیەکە) روو ئەکاتە شێخ عەلی ئەڵێ: أنت هم شێخ مەحشی ؟ ئەڵێ: نا نا آني شێخ عەلی ! ( عەلا ئەدین سەجادی ٢٠٠٥: ٢٠٦)

**<u>٥ – تایبەتییەکانی زمان تێکەڵکردن:</u>**

ئەو کەسانەی کە بە خێرایی و بە ئاسانی دوو زمان تێکەڵ دەکەن خاوەن چەند تایبەتییەکن. بە ڕای هەندێك تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن زمان تێکەڵ بکەن، کە بە تەواوی دوو زمانەکە دەزانن[1]. هەندێکی تر باوەڕیان وایە کە

---

(1) Poplack 1980: 598

تێکەڵکەران نەك هەر دەبێ دوو زمانەکە بە تەواوی بزانن، بەڵکو دەبێ هەر لە منالییەوە فێری ئەو زمانانە بووبن، چونکە بازدان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لە چوارچێوەی تاکە رستەیەکدا توانستێکی زمانیی بالآی دەوێ[٢] ئەم تایبەتییانە لە هەموو جۆرێکی تێکەڵکردندا پێویست نابن: هەندێ جار هەندێ کەس وشەیەك یان کەرەسەیەك دەخەنە ناو چوارچێوەی ڕستەیەکەوە لەبەر ئەوەی ئەو وشەیان لەسەر دەم نییە و بیریان چۆتەوە یان هێشتا فێری نەبوون لە زمانە بنەڕەتەکەدا. ئەو قسەکەرانەی کە زمان تێکەڵ دەکەن بەزۆری ئەوانەن کە لە چوارچێوەی یەك تاکە ڕستەدا تێکەڵییەکە ئەنجام دەدەن. بە باوەڕی ماکلور منداڵ لە تەمەنی هەشت ساڵیدا توانای تێکەڵکردن پەیدا دەکات، بەڵام لێکۆڵینەوەی تر سنوور بۆ تەمەن دادەنێن و لەناو کۆچڕەواندا زیاتر هەرزەکارەکان زمان تێکەڵ دەکەن.

**٦ – دوو بۆچوونی جیاواز بۆ زمان تێکەڵکردن:**

نزیکەی هەموو لێکۆڵینەوەکانی پێش ١٩٨٠ لە بواری زمان تێکەڵکردندا سەرنج بۆ گرینگی هۆکاری نازمانی ڕادەکێشن وەك بابەتی ئاخاوتن و شوێن و کات و پەیوەندی هاوبەشەکانی ئاخاوتن و بەها و نۆرمی کۆمەڵایەتی و گەشەی رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژی. هەموو ئەم هۆکارانە بەیەکەوە وا دادەنرا کە کاریگەری گرنگیان لەسەر هەڵبژاردنی زمانی ئاخاوتن هەیە. لە لێکۆڵینەوەیەکی بە ناوبانگدا[٣]، بۆ نموونە، بۆ یەکەم جار تێکەڵکردنی خوازەیی (مێتافۆری) لە تێکەڵکردنی باری جیاکردەوە. تێکەڵکردنی باری لە کاتێکدا ڕوو دەدات کە گۆڕانێك لە باری ئاخاوتندا سەر هەڵبدا. لە

---

(2) Mclaughin , 1987: 212
(3) Gumperz , 1982: 112

تێکەڵکردنی باریدا باوەڕ وەهایە، کە تەنیا یەکێك لەو دوو زارە یان زمانەی کە لەبەر دەستدان بۆ تێکەڵکردن تەنیا یەکێکیان بە کەڵکی بارێکی دیاریکراو دێ و قسەکەر ناچار دەبێت کە لە زمانێکەوە بازبدات بۆ زمانێکی تر تاوەکو لەگەڵ ئەو گۆڕانانەدا دەرچێت کە لە باری ئاخاوتندا ڕوو دەدەن. تێکەڵکردنی مێتافۆری، بە پێچەوانەوە، بۆ ئەو گۆڕانانە دێ لە هەڵبژاردنی زماندا کە تێیاندا بارەکە وەك خۆیەتی و نەگۆڕە. بادانەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لەم جۆرە تێکەڵکردنەدا پەیوەندی زۆر بەو مەبەستەوە هەیە کە قسەکەر دەیەوێ لە ئاخاوتندا بیگەیەنێت (مەبەستی قسەکەر). بەڵام لەبەر ئەوەی لە مەبەستی قسەکەر گەیشتن بەندە بە پەیوەندی نێوان زمان و ئەو بارەی قسەی تێدا دەکرێ، واتە دەبێت پێشەکی ئاگاداری هەڵبژاردنی زمانە لەبارەکە بین، پێش ئەوەی بتوانین واتای لادانەکە تێ بگەین، جیاوازی نێوان تێکەڵکردنی میتافۆری و تێکەڵکردنی بار کەوتە گومانەوە.

بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە کۆ زمانییە، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی پێشووەوە، بەدوای لێکۆڵینەوەیەکی گرنگ[1] کە تێیدا پێناسەی باری دایە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە، بۆچوونێکی تر هاتە ئارا لە ژێر ناوی شیکارکردنی ئاخاوتن. ئەم بۆچوونە هەوڵی ئەوە دەدات کە ڕەفتاری زمان تێکەڵکردن لە ڕێگەی دانە پاڵی واتای تایبەتی بە شوێنەکانی تێکەڵکردن بدات و واشی بۆ دەچێت کە قسەکەر دەیەوێ ئەم واتایانە لە گوێگر بگەیەنێت. گیروگرفتی مەبەست و واتا لە زمان تێکەڵکردندا لەوە دایە بزانرێ تا چ ڕادەیەك ئەو واتا و مەبەستەی شیکار دایدات بە شوێنە تێکەڵەکان هەر ئەو واتایانەن کە

---

[1] Auer 1984: 71

قسەکەر دەیەوێ بیانگەیەنێ و گوێگر وەریاندەگرێ[1]. بۆچوونی شیکارکردنی ئاخاوتن نایەوێت ئەو چوارچێوە تیۆرییانە فەرز بکات کە شیکار دایاندەنێ، بەڵکو بە دوای ئەو بنەما لە ژێرانەدا دەگەڕێ کە بە هۆیانەوە هاوبەشەکانی قسە خۆیان دەگەنە واتایی ناوچەیی لە هەڵبژاردنی زمانەکاندا. شیکارکارانی ئاخاوتن خۆیان بە جۆرێك لە شیکارکردن دەبەستنەوە کە هۆکارەکانی زمان تێکەڵکردن لە نۆبە لە دوای نۆبە زۆر بە وردی بخاتە روو. بۆچوونەکە زیاتر بەندە بەوەی واتای زمان تێکەڵکردن لە ئاخاوتندا دروست دەبێ.

شیکارکارانی ئاخاوتن لارییان لەوە نییە کە بە هۆی گەشەی مێژوویی و پایەی سیاسی جیاوازی زمانەکانەوە، تەنانەت لە نێوان یەك کۆمەڵیشدا، قسەکەران بە مەبەستی جیاواز و بە ڕێژەی جیاواز فێری زمانەکان دەبن. لەبەر ئەوە هەڵوێست و حەزیان بۆ ئەو زمانانەی لە ژینگەیاندا بەکاردێن لە وانەیە جیاواز بێت، بەڵام ئەمە نابێت وا بکات شیکار واتای خۆی، ئەگەر بەندیش بێت بەو زانینەی کە هەیەتی دەربارەی کۆمەڵێك، بدات بەو شوێنانەی کە زمان تێیدا تێکەڵ دەکرێ، بە تایبەتی ئەگەر شیکارەکە خۆی لە دەرەوەی ئەو کۆمەڵە بێت. گریمان ئەو زمانانەی لەیەك کۆمەڵدا بەکاردێن، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە گرنگیدا یەکسان نین، پرسی زمان تێکەڵکردن لەوەدا دەبێت بزانرێ چەند لەو واتایانە لە ڕێگەی ئاخاوتن و لە یەکتر گەیشتنەوە دێتە بەرهەم. بۆ زیاتر روونکردنەوەو تێگەیشتن لەم بۆچوونە با لەم ئاخاوتنە تێکەڵە ورد بینەوە کە لە ماڵی (ب) دا رووی داوە.

---

(1) Stroud, 1992: 142.

(أ) لاوێکی بیست ساڵەو (ب) ژنێکی چل ساڵ، پێکەوە نان دەخۆن، (ت) کچێکی هەرزەی (ب) یە، ئاخاوتنەکە پێش ئەم چەند گوتنە بە کوردی بووە:

(ب) فەرموو (مریشکەکەی لێ نزیك دەکاتەوە )

(أ) ها ( ٥ چرکە بێدەنگی )

(أ) ما شایف احمد من زمان. ( ٢ چرکە بێدەنگی )

(أ) أنت شایف احمد ؟

(ب) لا.

(أ) شفت علی ؟

(ب) ( روو لە (ت) دەکات ) میوەکان بێنە.

( روو دەکاتە أ ) لە کۆی ؟

کە (ب) فەرموو لە (أ) دەکات، (أ) کورتترین وەڵام دەداتەوە، ئەو بێدەنگییەی کە بە دوای ئەم گۆڕینەوەیە دادێ، نیشانەی کۆتایی هاتنە بەم کارە (فەرموو لێکردنەکە ). لە دوای (٥) چرکە، (أ) دەیەوێت بابەتەکە بگۆڕی و پرسیار لە بارەی ناسیاوێکەوە دەکات. ئەم گۆڕانە لە بابەتدا، بەندە بە گۆڕان لە هەڵبژاردنی زماندا، واتە (أ) لە کوردییەوە باز دەدات بۆ عەرەبی، کە جیاوازە لە زمانی نۆبەکانی (ب). ئەمجارە (ب) وەڵامی ناداتەوە " ئەمە (أ) ناچار دەکات کە گوتنەکەی دووبارە بکاتەوە لە شێوەی پرسدا نەك هەواڵ گەیاندن. وەڵامی (ب) ئەمجارە بە عەرەبییە، بەڵام تەواو کورتە. (أ) پرسیار لە بارەی ناسیاوێکی ترەوە دەکات (دیسان بە عەرەبی). لە دوای بێدەنگییەکی کەم (ب) گوێگرێکی تر هەڵدەبژێرێ (ت) و دەگەڕێتەوە بۆ کوردی " بۆ ماوەیەکی زۆر کەم (أ) لە ئاخاوتنەکە دەردەکات. لە دواییدا روو دەکاتەوە (أ) و بە کوردی لە گەڵیدا دەدوێ. کە لە ڕوانگەی کۆزمانەوانییەوە

لەم ئاخاوتنە دەکۆڵینەوە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بازدانەکەی (ب) لە عەرەبییەوە بۆ کوردی و پشتگوێ خستنی (أ) بۆ ماوەیەکی کورت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نایەوێت بە عەرەبی قسەی لەگەڵ بکرێ لەبەر ئەوەی لە هەڵبژاردنی زماندا و هەڵوێستی بۆ زمان، کوردی بە سەریدا زاڵە. لێکدانەوەی وەها شتێکی نوێ نادات بە دەستەوە. ئەوەی پێویستە شیکارکردنێکی وردی گۆڕینەوەکەیە، نەوبە لە دوای نەوبە، تا دەگەینە ئەو حەزو هەڵوێست و نۆرمانەی کە ئاخاوتنەکە بەرهەمیان دێنێ. بۆ نموونە، لەم ئاخاوتنەدا، (ب)، ژنەکە، عەرەبی بەکار دێنی ئەگەر چی زۆر بە کورتی ( تاکە وشەیەك ) لە وەڵامی پرسیاری یەکەمی (أ) دا. تەنیا کاتێك (أ) پرسیارێکی تر دەکات و لە دوای تێپەڕ بوونی دوو چرکە (ب) زمانەکە و گوێگرەکە دەگۆڕی. گۆڕینی زمانەکەو بەکارهێنانێکی ستراتیجی نۆبە گۆڕینی بە یەکەوە بۆ گۆڕینی بابەت و گوێگر، یاریدەی ئەوە دەدات کە حەزو هەڵوێستی بۆ زمانەکان دەربخات. بەم ڕێگەیە واتایەکی نوێی لە ئاخاوتنەکە دێتە بەرهەم.

**بەم جۆرە دەبینین کە ڕێگەی شیکارکردنی ئاخاوتن دوو سوودی گەورەی لێ دەبینرێ:**

١) بۆچوونەکە گرنگییەکی تەواو دەدات بە هەڵبژاردنی زمان لە نۆبە یەك لە دوای یەکەکانی ئاخاوتندا" واتە ئەو ڕاستییە دەخاتە پێش چاو کە هەڵبژاردنی زمانێك لە یەکێك لە نۆبەکاندا کار دەکاتە سەر هەڵبژاردنی زمانەکە لە نۆبەکانی تردا، لە لایەن هەمان قسەکەر یان قسەکەری ترەوە بێت.

٢) ڕادەیەك دادەنێ بۆ لێكدانەوەی شیكار بەوەی لێكدانەوەی شیكار بەند دەكات بە لە یەكتر گەیشتنی هاوبەشەكانی ئاخاوتن خۆیان كە لە رەوشتیاندا دەردەكەوێ.

ئەوانەی ڕێبازی شیكاركردنی ئاخاوتن بەكاردێنن گرنگی بە سێ خاڵ دەدەن: پەیوەندی نێوان گوتن و گوتنەكەی دوای خۆی، پەیوەندی نێوان نەوبە یەك لە دوای یەكەكان و كاریگەرییان لەسەر هەڵبژاردنی زمان یان تێكەڵكردنیان، هاوتایكردنی پێكهاتەی كۆمەڵایەتی و پێكهاتەی ئاخاوتن.

**٧ – شوێنەكانی زمان تێكەڵكردن لە ئاخاوتندا:**

تێكەڵكردن لە ئاخاوتنی بەردەوامدا بە زۆری لە هەندێ شوێندا دێ وەك لە دارشتنەوەی ڕستەو، خۆ ڕاستكردنەوە، پێش كۆتا هێنان و چیرۆك گێڕانەوەو بابەت گۆڕین و جیاكردنەوەی قسەی تێهەڵكێشراو، وەك لە خوارەوە لێیان دەدوێین:

**١) دارشتنەوە بەشێكە لە میكانیزمی ڕاستكردنەوە لە ئاخاوتندا**، قسەكەر بۆ ڕاستكردنەوەی ئەو زارە یان زمانەی كە لە بارێكی دیاریكراودا بە نائاسایی دێتە پێش چاو بەكاری دێنێ، هەروەك هەڵەیەكی كردبێت. دارشتنەوە لەو گۆڕینەوانەدا روو دەدات كە تێیدا بژاردە ئاسایییەكە بە پێویست دادەنرێ و دەبێتە ئاماژەیەكی ناڕاستەوخۆ بۆ توانست و حەزی قسەكەر و هەڵسەنگاندنی دوو زمانەكە لە لای كۆمەڵەكە، وەك لەم نموونەیەدا دەبینرێ قسەكەر لە وشەی "قطع" ی عەرەبی كە بە رێكەوت بەكاری هێنا پەشیمان دەبێتەوە دەگەڕێتەوە سەر كوردی:

أ. راستتر وەهایە ئەو پارانە راستەوخۆ لە راتبەكە قطع نەكەن یان نەیبڕن، بەڵكو دەبێ خۆمان بیگێڕینەوە بۆیان.

لێرەدا قسەکەر بە کوردی دەست پێدەکات لە پڕ وشەی (قطع) ی عەرەبی دێنێتە ناوەوە، بەڵام یەکسەر ڕستەکە دادەڕێژێتەوە لە دوای وشەی (یان) کە نیشانەی داڕشتنەوەیە، وشەی "قطع" وەردەگێڕێتە سەر کوردی. کردەی قسە بە تۆرەبڕین و نیشانەی داڕشتنەوە و وەرگێرانەکە هەموویان پێکەوە ڕێگەی ئەوە دەدەن بزانین قسەکەر بارەکە چۆن دەبینێ. لەم بارەدا بادانەوەی بۆ کوردی هەر بۆ روونکردنەوە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە بەکارهێنانی وشە عەرەبییەکە بە هەڵە دەژمێری و هەوڵی راستکردنەوەی دەدات.

**٢) خۆ ڕاستکردنەوە:**

هەندێ جار لە ئاخاوتندا زمان تێکەڵکردن بە تەنیا یان لەگەڵ هۆکاری تردا وەك قسە بەخۆ بڕین و بزوێن درێژکردنەوەو وەستان و دڵەڕاوکێ لە ئاخاوتندا بۆ خۆڕاستکردنەوە بەکاردێ. راستکردنەوەکە ڕەنگە هەڵەی تەواو بێت وەك لەم نموونەیەدا دەبینرێ:

أ. ئەم کوڕە کرێکارە، ئامۆزامە، من لێرە دام مەزراندووە.

ب. لە کوێ دەژی ؟

أ. في أربيل..... وا بزانم لە کەرکووك.

ڕاستکردنەوەکە هەندێ گیروگرفتێکە وەك گەڕان بە دوای وشەیەکدا وەك لەم نموونەی خوارەوەدا دەبینین لە نێوان دوو کارمەندی فەرمانگەیەك (أ و ب) باس لە هاوڕێیەکیان دەکەن (ج) کە کێشەی لەگەڵ مێردەکەیدا هەیە. (ب) باس لە ڕێزی خۆی بۆ کارمەندەکە دەکا (أ) کە وەك خوشکی وەهایە یان وەك دایکی. لەم کاتەدا (ب) کەسی تری لە خەیاڵدا نییە کە لە دایکی ئازیزتر بێت. لەبەر ئەوە قسەکە بە خۆی دەبڕێ و دەوەستێ بۆ ماوەیەك تا وشەیەك بدۆزێتەوە. کە دەربڕینەکەی بۆ دێ، بە عەرەبی دەبێ لە کاتێکدا کە هەموو

ئاخاوتنەکە کوردییە. لێرەدا زمان تێکەڵکردنەکە ئاماژەیە بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکە.

(ب): کەس ناتوانێ ڕای من بەرامبەرت بگۆڕی. چی دەڵێن با بیڵێن پەیوەندی بە منەوە نییە. تۆ بۆ من لە خوشك زیاتری، لە دایك فەرزتری و چاکتری ما أدري شأگول.... تۆ لە ناخۆشیدا فریام دەکەوی.

زمان تێکەڵکردن زۆر جار لەگەڵ میکانزمی ڕاستکردنەوە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی لە نۆرە بڕینەوە پەیدا دەبێ. لە نموونەی خوارەوەدا (أ) باس لە سەردانێك دەکات بۆ لای (ب) بۆ هاوڕێکەی (ج). لە شوێنێکدا کە بۆ گۆڕینەوەی نۆرە یان قسەکەر دەست دەدات (ج) نۆرەی قسەکردن دەبات باس لە چارەیەك دەکات کە (ب) بۆ چاکبوونەوە دەبێ بیکات. بەلاّم (أ) لە قسەکردن ناکەوێت، لە ئەنجامدا قسەکانیان یەکتری دەبڕن، تا ئەو کاتەی ڕاستکردنەوە دێتە ئارا کە بە زمانی عەرەبییە و بەردەوام دەبێت.

(أ) دوێنێ سەرێکم لێدا، تووشی سك چوون بووە. حەزم لە برنج نییە، دەیگوت، لەبەر من بیخۆ ئەگەر حەزی لێ ناکەیت.

(ج) [ على أية حال يحتاج الى الابر ]

(أ) بەڵێ دەرزی لێدابوو. یەك دەرزی.

(ج) أبرة واحدة فقط !

**٣) ئاماژە بۆ پێکهاتەی ئاخاوتن:**

هەندێ جار زمان تێکەڵکردن وەك هۆکارێك بە کاردێ بۆ دیاریکردنی پێکهاتەی ناوەوەی ئاخاوتن، واتە کەرتبوونی بۆ سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی و پێش کۆتا. خستنە پاڵ یەکتری دوو زمان هەندێ جار بۆ نیشاندانی

سەرەتاو کۆتایی و پێش کۆتایی ئاخاوتن بەکاردێ وەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێت کە تێیدا زمان تێکەڵکردن بۆ کۆتایی هێنان بە ئاخاوتنەکە بەکارهاتووە. لێرەدا (ب) عەرەبی لە پێش کۆتادا بە کاردێنێ لە (جید عزیزی) وە بەردەوام دەبێت تا کۆتایی بە ئاخاوتنەکە دێنێ.

أ: دوو شەمە خۆم لێرە دەبم، ئەمر دەکەیت.

ب. جید عزیزی. ما أرید أزعجك.

أ. گوێ مەدەرێ. ئیزعاج نییە.

ب. نلتقي انشاء الله الاثنین. مع السلامة.

**٤) بابەت گۆڕین:**

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە قسەکەران زۆرجار لەو باوەڕەدان کە هەر زمانە لەو زمانەی دەیزانین زیاتر بۆ بابەتێك دەشێ نەك بۆ هەموو بابەتێك.، لەبەر ئەمە کارێکی ئاساییە قسەکەر لە زمانێکەوە بازدا بۆ زمانێکی تر بە پێی ئەو بابەتەی لە بارەیەوە دەدوێ. لەم نموونەیەی خوارەوەدا (أ) بە عەرەبی دەست پێدەکات چونکە لە لای (أ) عەرەبی زمانی رامیارییە و زاراوەکانی بەسەر دەمەوەن بەڵام (ب) بە کوردی وەڵام دەداتەوە چونکە بابەتەکە دەگۆڕی بۆ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی:

أ. أنا ما شایف سیاسي فاشل مثل أخونا العزیز.

ب. بابەتەکە بگۆڕین. کەی سەرێکی لێ بدەین و شەوێك لە ڤیلاکەی بمێنینەوە ؟

**٥) جیاکردنەوەی گوتنی تێهەڵکێشراو:**

قسەکەر زۆر جار دوو زمان تێکەڵ دەکات کە قسەی خەڵکێکی تر دێنی یان تەنانەت قسەی خۆی کە لە بۆنەیەکی تردا گوتراوە دەگێڕێتەوە. ئەمەش

دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەیەوێت قسەکە بە ئەمانەت بگۆزێتەوە یان لاسایی قسەکەرەکە لە نزیکەوە بکاتەوە. وەك لەم نموونەیەدا دەردەکەوێ:

أ. کە یەکترمان دیت لە ناوەڕاستی جادەکە ڕای گرتم و بە دەنگە ناخۆشەکە پرسی: **شتسوي هنا !**

هەندێ جار دیاردەکە بە پێچەوانەوە روو دەدات: قسەکە لە بنچینەدا بە زمانێك بووە، کەچی قسەکەر کە دەیگۆزێتەوە زمانێکی تر بەکاردێنێ. وەك لەم نموونەیەدا دەردەکەوێ: کچەکە لە بنەڕەتدا بە کوردی قسەکەی کردووە کەچی کە (أ) دەیگۆزێتەوە دەیکات بە عەرەبی:

أ. کە من گەیشتم کچەکەت دەڕۆشتە دەرێ. گوتی: " جيد **أگدر** أنطيك عشر دقائق من وقتي فقط " منیش سوپاسم کرد و دەستمان کرد بە قسەکردن.

## ٨ – شوێنەکانی تێکەڵبوون لە ڕستەدا: Mix Sites

ئەم بەشە جۆرەکانی سنووری سینتاکسی تاقی دەکاتەوە. شوێنەکانی ڕستە لەو شوێنانەی تێکەڵبوون دەکرێ دەربکەون لە ئاخاوتنی کوردی و عەرەبی و کوردی و تورکمانی لە کاتی تێکەڵبووندا، بۆ دەرخستنی ئەوەی ئەگەر هەندێ بەیەکەوە ببەسترێنەوە بەهەر ڕێگەیەك، ئایا تێکەڵبوون لە گەڵیاندا یان لە نێوانیاندا دەشێ، وەکو ئەوەی کە گریمانە کراوە لە لێکۆڵینەوەکاندا.

لێرەدا ژمارەیەك شوێنی سینتاکسی جیاواز هەیە کەوا تێکەڵبوون تیایدا دەکرێ ڕووبدات یان ڕێگەی پێ بدرێ، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بۆچوونە ئێمە باس لە تێکەڵبوونی نێوان کلۆزەکان دەکەین، کە وەکو بەشێك لە کلۆزەکە مامەڵەی لە گەڵدا دەکرێ.

١. **شوێنی تێکەڵبوون لە نێوان دوو کلۆزدا:** Inter clausal Sites

دەیتاکان ژمارەیەك نموونەی جیاواز لە تێکەڵبوونی زمانەکاندا لە سنووری ڕستەدا دەخەنە ڕوو:

جۆرە تێکەڵبوونێك هەیە بەهۆی (لێکدان)ەوە دەبێ، لێرەدا گەلێك شێوە (قالب) وەردەگرێ:

**یەکەم:** دوو ڕستە یەکیان بە زمانی عەرەبی، یان تورکمانی، ئەوەی تریان بە زمانی کوردی دەبێ، یان بە پێچەوانەوە، ئەمەش دەکرێ بەبێ بەکارهێنانی ئامرازی لێکدەر ڕووبدات. وەکو لە:

١- أ. ماما تعال مینا دەگری. (عەرەبی – کوردی)

ب. قۆیون گیالدی مندالەکە ترسا. (تورکمانی – کوردی )

٢- أ. قۆرت. نوگرە – Ø

ب. نزیك – تی (د) ی

دەبێ تێبینی ئەوە بکرێت، کەوا لە زمانی تورکمانی، بەتایبەتی لە ناو شاری هەولێر هەر تورکمانێك کوردی بزانێ زۆر بە ئاسایی، کاری (بوون) کە بەرامبەر بە (di) تورکمانی دەوەستێ وەری دەگرێ و زۆربەی پاشگرە ڕێزمانییەکانیش هەمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و پێچەوانەکەشی ڕاستە.

دەبێ ئەوەش بڵێین، کەوا (di) زۆرجار لە سیاقێکی فۆنەتیکیدا بە پێی هەندێ یاسای فۆنۆلۆجی (گڕوکپ) لە کۆتایی وشەکەدا دەبێ بە (ti).

**دووەم:** ڕستەی کوردی پاش یان پێش ڕستەی عەرەبی، یان تورکمانی دەکەوێ لە پەیوەندی ڕستەی شوێنکەوتوودا، بە بەکارهێنانی ئامرازی لێکدەر لە هەمان زماندا.

١. أ. دەخۆی أم لا.

ب. دێی، یۆخسە مەن گێدم.

نموونەکانی پێشتر ئەوە دەگەیەنن، کەوا گەر تێکەڵکردنەکە کە لە نێوان دوو ڕستەی لێکدراوی یەك ئاستدابن، ئاڕاستەکە دەکرێ لە زمانی کوردییەوە بۆ زمانەکانی تر بڕوات، یان بە پێچەوانەوە، بەڵام ئامرازە لێکدەرەکەو ڕستەی دووەم لە هەمان زماندا دەبن. دەبێ تێبینی ئەوەش بکرێ سەبارەت بە زمانی تورکمانییەوە، زمانی تورکمانی لە شاری هەولێر زۆربەی ئامرازە کوردییەکان بەکاردێنێ، بە هۆی تێکەڵبوونی دوور خایەنی ئەو دوو زمانە، ئەمەش دەکرێ لە چوارچێوەی ململانێی نێوان زمانەکان (صراع اللغات) و لەسەر بنەمای چەندایەتی و چۆنایەتی شیکردنەوەو لێکدانەوەی بۆ بکرێ. لە لایەکی ترەوە زۆرجار ئامرازەکە بە تەنیا دەکەوێتە ناو ڕستەی تورکمانییەوە، وەکو:

٤- أ. خۆزگە ئەمنیش گیال – م – شتم

ب. ئەگەر گیدسەن مەندە گیالیرەم

ج. ئەگە – Ø گیالمسەن ئەمن ناچم

**سێیەم:** زمان تێکەڵکردن هەندێ جار لە نێوان ڕستەی سەرەکی و ڕستەی شوێنکەوتوودا ڕوودەدات، لە ڕستەیەکی لێکدراودا، دەقە ئاخاوتنەکە بریتی دەبێ لە، هەواڵدان، ئەرێ، لە پاڵ ڕستەی ئاوەڵکاری هۆیی، و ئامانج و ڕستەی مەرجی.

٥. أ. دەزانم ش – یسوي.

ب. نازانم هەرە دوشتی

٦. أ. ادري سازە نەخۆش – Ø.

ئەم ڕستەیە لە تێکەڵبوونی تورکمانی بە کوردی شێوەیەکی تر وەردەگرێ، لەوەی پاشگرە تورکمانییەکە دەچێتە کۆتایی وشە کوردییەکە.

ب. دیرار سەنعان نەخۆش ت (د) ی.

ج. دەڵێن سەنعان ——— خەستاد′ی (نەخۆشە)

خەستا′یدی ( نەخۆش بوو) = Stress

٧- أ. اذا سأل لیلی من دێم.

ب. ئەگەر مانی سۆریسەن ئەمن لێرەم.

٨- أ. نازانم ش — وکت یجي.

ب. نازانم هەزەمان گۆر یچری.

٩. ئەمە بالیف — ا لي — ترید.

جۆرێکی تر لە تێکەڵبوونی ڕستەکان، کە زۆر دووبارە دەبنەوە لە ئاخاوتندا. چوونە ناویەکی ڕستەکانە بە بێ بەکارهێنانی ئامرازی لێکدەر، هەردەم ڕستە عەرەبییەکە دەکەوێتە ناو پێکهاتی ڕستە سەرەکییەکەی زمانی کوردی.

١٠. أ. کوڕەکە — أعرف نایە.

ب. دارا تعرف نەخۆش — Ø.

لە تێکەڵبوونی زمانی تورکمانی و کوردیدا، یان لای پێشەوە بەر زمانی تورکمانی دەکەوێ، یان لای دواوە، واتە ئەو چوونە ناو یەکەی ڕستەکان، کە لە ڕستەی (١٠، ١١) بەدی دەکرێ لە تێکەڵبوونی یان کەمە، یان هەر نییە.

١١- أ. باش دەزانم نە یە تیسەن.

ب. بیلیرەم ئەحمەت نەخۆش — تی.

ج. ئەو کوڕەم لۆت هێنایە , یارن وەستایە.

د. بیرانجی وەستام لۆت هینایە.

هەروەها پێچەوانەکەشی دەشێ، واتە کەرەسە تێکچرژاوەکە لە زمانی کوردی و ئەوی تریان بە زمانی عەرەبی، ئەم ڕستانەی خوارەوە بڕیار لەسەر ئەو تێکەڵبوونە دەدەن:

١٢. أ. عندی دەزانی شقە — و— سەیارە.

ب. دوو چەرخەل وردم — و — گیالدم.

**٢. لە سنووری ڕستەی سادەدا.** Inter Clausal Mixes .

ئاخاوتن گەلێك نموونەی تێکەڵبوون دەگرێتە خۆ لە سنووری کەرەسە سەرەکییەکاندا کە لەم شوێنانەی خوارەوە بە دەردەکەون:

١. لە نێوان بکەرو گوزارەدا (پرید یکات) دا گەلێك تێکەڵبوون هەیە، کەوا بکەر لە زمانی کوردیدا دەبێ و پرید یکات لە زمانی عەرەبی و تورکمانیدا دەبێ. ئەم نموونانەی خوارەوە ئەم خاڵەی سەرەوە ڕوون دەکەنەوە:

بەر لە خستنەڕووی نموونەکان سەبارەت بە تێکەڵبوونی زمانی تورکمانی لەگەڵ کوردی جیاوازییەك بەدی دەکرێ و بە ئاسانی ناچێتە ژێر باری ئەو خاڵەی سەرەوە، بە بۆچوونی ئێمە، زمانی تورکمانی ئەگەر چی پریپۆزشن بە کار ناهێنێ وەکو وشەیەکی ئەرکی سەربەخۆ، بەڵام پاشماوەی دۆخی جێنەتیف لە حاڵەتی دانەپاڵدا بەر چاو دەکەوێ، کە بریتییە لە(da:) .

١٣– أ. ئەو با ل — باب.

ب. ئەو باخچە دا — دی.

١٤– أ. ئەوە مثل بابا.

ب. ئەوە سانوە کادی

تێکچرژانەکە هەندێ جار بەم شێوەی خوارەوە دەبێ:

١٥– هي زۆر جوان.

١٦- اهنان باليف خۆت.

دەبێ تێبینی ئەوەش بکرێ، کەوا لەو نموونانەی سەرەوەدا بکەر لە زۆربەیاندا جێناوی نیشانە، یان ناوی تایبەت دەبێ و پریدیکاتەکانیش بە گشتی کاری بوون دەبن و ڕستەکانیش نیهاد و گوزارە دەبن، هیچ نموونەیەك لە بارەی بکەرو کردار نییە لە نموونەکانماندا کە تێکەڵبوون نیشان بدات بەهۆی کرداری تێنەپەڕو تێپەڕەوە تا ئێستاش نموونە داڕێژراوەکانی پریدیکاتەکانی تێنەپەڕو تێپەڕ لە حوکمی شیاودایە.

١٧- أ. ئەو بال - باب نامت.

ب. ئەو ئۆرە ئون ئۆ لیری.

١٨- أ. ئەو شرب الماي.

ب. ئەمن بەرماغم قرلدی.

هەروەها لەو نموونانەی سەرەوەدا، بکەر لە زمانی کوردییە و پریدیکات لە زمانی (عەرەبی و تورکمانی)یە، بەڵام پێچەوانەکەشی دەشێ:

١٩- أ- کلب نوست - Ø.

ب. میوانەکە ئۆلا ش - تی.

٢٠- أ. طفل سێو خوارد.

ب. بەبەو مەکتوب دەنووسی.

ج. قارداش - و - غەرازەکە برد - ی.

دەبێ تێبینی ئەوەش بکەی، کەوا تێکەڵکردن لە نێوان زمانی کوردی و عەرەبیدا، نووسەکی کردارەکان، کە وەکو نیشانەی ڕێکەوتن یان بەرکار کار دەکەن، لە ئاخاوتنی تێکەڵدا دەرناکەون، نموونەی (٢١) لە کەرەسەکانی ئێمەدا دەرناکەون:

٢١– أ. همَ نوستن.

بەلاّم لەگەلّ زمانی تورکمانیدا لە هەندێ باردا دەردەکەون:

ب. سز وەرن لۆ ئێرە.

ئەمەش بەهۆی ئەوەی دوو زمانەکە زۆر لە یەکتر نزیك و زۆر تێکەڵن لە چوارچێوەی یەك پۆلی زمانیشدان (SOV).

ج. ئۆلار چوون.

**٣. تێکەڵبوون لە سنووری فرەیزدا:**

**١:٣ فرەیزی ئاوەڵکاری.**

لە تێکەڵبوونی ڕستەکاندا ئاوەڵکارەکان ئازادانە لە سنووری ڕستەدا بەدەردەکەون وەکو ڕستەی پێچەوانە ئاسایی تێکەڵ دەبن، چونکە لە هەموو زمانەکەدا ئاوەڵکار چالاکە لە شوێن گۆڕکێ و گەلێك شوێن داگیر دەکات، بە هەمان شێوە لە زمانی تورکمانیشدا.

٢٢– أ. شویة دانیش.

ب. بیر أز بڕۆ پێش.

ج. بیر أز پالّدە.

د. دەها بڕۆ پێش.

٢٣– أ. لە ڕێیا بەنزین خلص.

بەلاّم لە زمانی تورکمانی لە تێکەڵبووندا لەگەلّ زمانی کوردی بارێکی تر وەردەگرێ، بەهۆی ئەوەی پرپیۆزشن لە زمانی تورکمانی لە شێوەی گیرەکی ڕێزمانی (پاشگر) ڕەفتار دەکا.

ب. لە بازێڕێ هیچ قالمادی.

ج. بازاڕ دە پرنج نەمایە.

د. له کێندەرێ گیالبسەن.

ه. هەردەن دەخینی.

**٢:٣ تێکەڵبوون لە سنووری فرێزی کاریدا:**

دەقی ئاخاوتن ژمارەیەك نموونەی لە خۆ دەگرێ سەبارەت بە فرێزی کاری، زۆربەیان گۆڕینی بەرکاری کوردی بەکاردێنن.

٢٤- أ. من نملة کوشت.

ب. ئەمن سوو خواردم.

ج. ئەمن نەنەودەن قسە کردم.

٢٥- أ. من سترة نی - یە.

ب. ئەمن پەرە نیتی.

لەوانەیە دووبارەبوونەوەی تێکەڵبوونەکە بەو جۆرە بێ، کە جێگۆڕینی پێکهاتەی یەکەمی کردارە لێکدراوەکە، کە بریتییە لە NP لەگەڵ کردارێکی دیلێکسیکی (delexical- verb) دەربکەون بە تایبەتی کرداری (kird)، وەکو:

٢٦- أ. لزم کرد.

٢٧- أ. مسواك کرد.

سەبارەت بە زمانی تورکمانی بە هۆی کەم چالاکی کرداری کردن (edir) ئەم جۆرە تێکەڵبوونە کەم ڕوو دەدات و لەوانەشە بە کارهێنانەکە لە شێوەی خۆیدا نەبێ:

٢٦- ب. ئوتان دەکەم.

٢٧- ب. شەرم ئێدەرەم.

دووباره دەبێ تێبینی ئەوەش بکرێ، کەوا هەندێ تێکەڵبوون، نووسەك بە کار ناهێنن هەر ئەرکێکیان هەبێ، بە هۆی سەرنەکەوتنی نووسەکەکان لە (٢٦ و ٢٧) دا. تەنیا بە پەنابردنە بەر سیاقەکە، یان هەڵوێستی قسەکردنەکە، دەتوانین قسەکەرەکە یان قسەکەرەکان دەستنیشان بکەین، ئەم کۆتبەندەش لە هەردوو زمانەکە (کوردی و عەرەبی)دا جێبەجێ دەکرێ، ئەو دیاردەیەش دەبێتە مایەی دروستبوونی هەندێ ڕێگری گشتی، کە ڕێگە لە تێکەڵبوونی مۆرفیمە بەندەکان بگرێت. بە تایبەتی لە ئاستی مۆرفۆلۆجی کردارەکاندا[1]. بەڵام ئەم ڕێگرییە لە نێوان زمانی کوردی و تورکمانیدا لە کاتی تێکەڵبوونیاندا بەدی ناکرێ. چونکە نووسەکەکان لەم دوو زمانەدا لە ئەرك و پێکهاتی دەنگیدا زۆر نزیکن لە یەکترو زۆرجار لە هەندێ لە کەسەکان یەك دەگرنەوە، لەبەرئەوە کۆتبەندی تێکەڵ نەبوونی مۆرفیمە بەندەکان لە زمانەکەدا ڕادەگیرێ، بە تایبەتی نووسەکەکان و نیشانەی ناسیاوی (بەڵام نە ناسیاوی، وەکو وشە یان مۆرفیمی ژمارە بەکاردەهێنرێ).

کوڕ + ەکە + م

ئۆغلانە کەم

ئۆغلان – ەکە – م نوستیە.

### ٣:٣ تێکەڵبوون لەگەڵ فرەیزی بەندا

گەلێك نموونەی تێکەڵبوون هەیە بە گشتی PP بەکار دەهێنن، سەبارەت بە فرەیزی بەند دەکرێ لە زمانی کوردیدا بێت و پاشماوەی ڕستەکەش لە

(1) Pfaff 1979: 303

زمانی عەرەبی بێت، یان بە پێچەوانەوە، ڕستەکانی (١٣ , ٢٣) وەکو ٢٨ بەرهەم بهێنرێتەوە و لە ٢٨ و ٢٩ ی خوارەوەدا ڕوون دەکرێتەوە:

٢٨- ئەو بالباب.

٢٩- لە ڕێیا بنزین خلص.

سەبارەت بە زمانی تورکمانی و کوردی ئەو حاڵەتە دەبێ کە PP بیەکە لە زمانی کوردی بێت، بەڵام پێچەوانەکەی قەبول ناکرێت بە هۆی ئەوەی کەوا (pp) لە زمانی تورکمانیدا قالبێکی تر وەردەگرێ، چونکە (وەکو وتمان ) پریپۆزشنەکان لە زمانی تورکمانیدا وەکو گیرەکی ڕێزمانی ( پاشگر ) ڕەفتار دەکەن و ناکرێ لە (NP) ەکە دابڕێ، بۆ نموونە ئەگەر PP بیەکە لە زمانی کوردی بێت کێشە لە تێکەڵبوونەکە دروست ناکات.

لەو مەکتەبەی ئۆخ — م. شەم. (لەو خوێندنگایە خوێندوومە)

بەڵام ئەم ڕستەی خوارەوە ڕێگەی پێ نادرێ

* هاردەن هاتی.

هەروەها دەکرێ لە تێکەڵبووندا سەبارەت بە پریپۆزشنەکان و ئامرازەکان لە زمانێکدا بن و بەرکار لە زمانەکەی تردا بێ.

٣٠- شفتة با ل — ڕێ.

٣١- لە دەربونە — نوست.

تێبینی ئەوەش بکە، کەوا ناوە کوردییەکان، کە بە هۆی نیشانەی ناسراوی عەرەبی دەناسرێن، لەو شوێنانەدا دەردەکەون. ئەو نموونانەی خوارەوە ڕێگەیان پێ نادرێ، چونکە ناوە کوردییەکە نەناسراوە وەکو لە (٣١ و ٣٢) دا، یان بە نیشانەی ناسیاوی کوردی (ەکە) ناسراندراوە وەکو لە نموونەی (٣٣) دا.

٣٢- أ.  ب – ال – كۆلان نوست.

٣٣- أ.  بالكۆلانەكە نوست.

ئەمە لە تێكەڵبوونی كوردی و توركمانیشدا شێوەیەكی تر وەردەگرێ.

٣٢- ب. ئاو – دەن ئیچ ئۆزینە.

لێرەدا سەبارەت بە پرییۆزشنی زمانی عەرەبی ناكرێ دەسەڵات بە سەر ناوێكی نەناسراوی كوردیدا بدات، بەهۆی ئامرازێكی زمانی عەرەبییەوە، زانیارییەكانی ئێمە ئەو نموونانەی تێدا نییە، كەوا پرییۆزشنەكە لە زمانی كوردیدا بێ و بەركارەكەی لە عەرەبی، بەمەش بڕیار لەسەر ئەوە دەدەین كەوا( ٣٤, ٣٥ , ٣٦ ) ئەگەری تێكەڵبوونیان نییە.

٣٤- لە بیت نوست.

٣٥- بە آني.

٣٦-  تا مساء.

لە زمانی توركمانیش لە تێكەڵبوونیدا بە كوردییەوە ئەم بارەی سەرەوە نایەتە كایەوە.

شەوە قەدەر ( تاكو شەو ).

بە ئەیاغتەن ( بە پێ ).

دەقە دارێژراوەكانی پفاف ( ١٩٧٩) ئەوە دەردەخەن كەوا ناكرێ پرییۆزشن لە زمانە جیاوازەكاندا لە هەردوو بابەتەكانی پێشترو پاشتریشدا بێنە كایە، هەتا ئەگەر تێكەڵبوونەكەی PP یەك ئاراستە وەربگرێ، هەروەها پرییۆزشن و ئامرازەكان دەكرێ لەیەك زماندا بن. هەروەها دەیتاكان ئاماژە بەو ڕاستییەش دەدەن كەوا پرییۆزشن لە زمانی كوردیدا دەتوانێ دەسەڵات بەسەر NP ییەكی عەرەبی دابگرن لە نەبوونی ئامرازێكدا. بە كورتی تێكەڵ

لە میانەی سنووری PP یدا ڕێگەی پێ دەدرێ یان لە ڕێگەی PP ییەوە لە ناو سنووری NP یدا وەکو لە ٣٧ دا بەلاّم لێرەدا لەناو PP ییەکی تردایە.

٣٧- أ. ئەو تحت الماي.

ب. ئەو في ال — کۆلان.

لە تێکەڵبوون بە زمانی تورکمانییەوە

ج. ئەو دیوار — ین — ئالتن دادی. (ئەو لەژێر دیوارەکەیە)

د. ئەو بەزار دادی. (ئەو لە بازاڕە).

**٤:٣ تێکەڵبوون لە فرەیزی ناویدا:**

گەلێك نموونە لە دەقە ئاخاوتنەکان بەرچاو دەکەوێ سەبارەت بە تێکەڵبوون لەگەڵ NP ییەکی ژمارەیی لە زمانی کوردیدا، لەگەڵ یەکێکی عەرەبیدا، بە ئاڕاستەی پێچەوانەوە، وەکو ئەو نموونانەی خوارەوە:

٣٨- دز یەك قەمیس.

٣٩- ارید اثنین پیاو.

لە فرەیزی ناویدا جێناوی نیشانە دەکرێ لە زمانی عەرەبی بێ و سەرەی ناوەکەش لە زمانی کوردی بێت، بواری ئەوەش دەدرێ، کەوا ئامرازی ناسیاوی کە پێچەوانەکەیەتی لە زمانی عەرەبیدا بێ.

٤٠- أ. ارید ذاك — ال دار.

لە زمانی تورکمانیدا بە پێی سیستەمی ڕیزبوونی کەرەسەکانی ئەو زمانە ڕۆنانی ڕستەکە لەگەڵ پاراستنی چەمکی واتایی ڕستەکە دەگۆڕێ:

ب. ئۆ چەقۆ — نی ئیستیرەم.

ج. بو پوچاخ بدە بە من.

کاتێك کە NP بە هۆی ناوێکەوە کە ئاوەڵناوێکی بە دوا دادێ دروست بکرێ، بە شێوەیەکی گشتی NP ییەکە دەکرێ لە هەر زمانێکدا بێت " بەهەمان شێوە سەبارەت بە ناو و ئاوەڵناوەکەوە. سەیری ئەمانە بکە:.

٤١- ارید غرفة زۆر گەورە.

٤٢- ارید خانی گچکە.

٤٣- أ. ارید خانی کبیر

ب. بیر دام زۆر ئەنتیکە تاپتم. (خانوویەکی عەنتیکەم دۆزییەوە)

ج. ئەمن چۆخ ماندییەم.

د. یەك ئەییی خەبەر هەیتم لۆ توو.

٤٤- عندی دار گەورە

مەزندەکردنی ئەو ئەگەرانە لە بارەی تێکەڵبوون لە سنووری جیاوازدا هەوڵ نەدراوە وەکو ئەرکێکی جێگیری لێ بێت، ئێمە ئەوەمان دۆزیوەتەوە کەوا تێکەڵبوون دەکرێ بێتە کایە لە سنووری ڕستەداو لە چوارچێوەی NP و VP و Adv P و PP یدا بێتە کایەوە هەروەها تێبینی ئەوەش دەکرێ، کەوا سنووری ناوەوەی مۆرفیم داخراوە لە ڕووی تێکەڵبوونەوە، هەروەها هیچ تێکەڵبوونێك ئەگەری نابێ لە نێوان ڕەگی کارو نووسەکەکانیەوە، لە هەندێ باری زمانی تورکمانیدا نەبێ.

**٥:٣ تێکەڵبوون و نا هاوتایی ڕۆنانەکان:**

مەزندەکردنی ئەگەرو نەگەری تێکەڵبوون، کە لە بەشی پێشتر خرایە ڕوو ئەوە دەگەیەنن کەوا تێکەڵبوون دەکرێ ڕوو بدات تاکو لەو شوێنانەش یان ئەو بەشە ڕۆنانەش، کە هاوتایی و گونجانیشی تێدا نییە، لەو شوێنەی، کە دوو زمانەکە جیاوازن لە ڕێکخستنی ڕۆنانی سەرەوەیاندا، ئەو لادانە

لەکۆتبەندی نا هاوتایی (EC) لە لایەن ( لیپسکی ١٩٧٨: ٢٥٠ )ەوە داڕێژراوە و لە لایەن (پۆپلاك (١٩٨٠)، پفاف (١٩٦٩): ٥٨ ) ەوە پێشگیری لێ کراوە، لێرەدا هەندێ حاڵەت دەخەینە ڕوو، کە تیایدا کۆتبەندەکان پشتگوێ خراوە (پەڕێنراوە)[1].

١. حاڵەتی تێکەڵبوون لە نێوان تەواوکارو کاری سەرەکیدا. لە زمانی عەرەبیدا کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە زمانەکانی (VSO) یە دەژمێردرێ. بەرکار لە دوای کردارو بکەردا دەردەکەوێ، هەروەها لە کوردیشدا کە لە زمانەکانی (SOV) یە کەرەسەکان هەندێ نموونەی تێکەڵبوون لە خۆ دەگرن، کەوا ڕیزبوونی کەرەسەکانی لە (SOV) یدا دەخاتە ڕوو.

نعال لە بەر کرد.

زمانی تورکمانی لە جۆری زمانەکانی وەکو زمانی کوردی لە جۆری (SOV) ییە، لەبەر ئەوە حاڵەتی یەکەمی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، بەڵام ئەم جۆرە تێکەڵبوونەی خوارەوەش ڕێگەی پێ دەدرێ

اسباب — و — داگیش بکە. (جلەکانت بگۆڕە)

جلکت داگیش بکە.

قارپوزەکە بخۆ. ( شووتییەکە بخۆ)

بو فیات چەندە ؟

بێشکەکانی قالدر قۆی مانگاکە تێپەڕ ئۆلسون

نموونەکان وای دەردەخەن، کەوا ڕۆنانی سەرەوەی زمانی کوردی هاوتا نییە لەگەڵ ئەو ڕۆنانەی سەرەوەی، کەوا لە زمانی عەرەبیدا بەدی دەکرێ، لەگەڵ

---

(1) Lipski 1978: 250

ئەوەشدا تێکەڵبوونەکە بە تەواوی لە هەردوو ئاڕاستەکەدا قەبوڵ دەکرێ سەیری ئەمانەی خوارەوە بکە:

أشرب ئاو.

بەڵام ڕۆنانی سەرەوەی زمانی تورکمانی تا ڕادەیەك لەگەڵ زمانی کوردی هاوتان لەبەر ئەوە تێکەڵبوونەکە ئاساییترە لەوەی لەگەڵ زمانی عەرەبیدا دێتە کایە.

یەماغ دەخۆم.

٢. بارێکی تری نا هاوتایی بەکارهێنانی نیشانەی ناسیاوییە، لە زمانی عەرەبیدا نەك لە زمانی کوردیدا نیشانەی ناسیاوی پێش ناوەکە دەکەوێ وەکو (al gurFa) یان (al gurFa al kabi:ra-)، لێرەدا ئاوەڵناو لەگەڵ NP یەکی ناسراودا وەکو مۆدیفایەری ناوێك دەبێ " بە هاوکاری ئامرازی ناسراوی. لە زمانی کوردیدا نیشانەی ناسیاوی مۆرفیمی بەندە و بە کۆتایی NP ییەوە دەلکێ وەکو ( دارەکە، یان دارە گەورەکە ). لێرەدا بە ڕوونی حاڵەتی نا هاوتابوونی دوو زمانەکە، لە ڕۆنانی سەرەوەی هەردوو زمانەکەدا نیشان دەدات.

لێرەدا ئێمە تێکەڵبوون لە NP یەکی ناسراودا بە ئاراستەی عەرەبیەکە بەدی دەکەین نەك بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانەوە لە شکاندنی کۆتبەندی (EC) وەکو لە:

٤٧- أ. ال - بنت - ب - ال - کۆڵان

بەڵام بەهۆی ئەوەی زمانی تورکمانی هەمان ئامرازی ناسیاوی (ەکە) بەکاردێنن و هەردووکیان لە جۆری (SOV) ین هیچ نا هاوتاییەك لە هەردوو ئاڕاستەکەدا بەدی ناکرێ.

ب. ئوشاغەکە مرد - ی.

ج. منداڵەکە ئولد - د - ی.

کە لەناو هەولێر بەکارهێنانی ئەو ڕستەی سەرەوە زۆر باوەو زۆریش دووبارە دەبێتەوە.

نموونەکان وای دەردەخەن کەوا ڕۆنانی سەرەوەی زمانی کوردی هاوتا نییە لەگەڵ ئەو ڕۆنانەی سەرەوە، کە لە زمانی عەرەبیدا هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا تێکەڵبوونەکە قەبووڵ دەکرێ، بە هەردوو ئاڕاستەکەوە.

٣. بارێکی تری نا هاوتایی لە سیستەمی دیارخەرەکاندا لە هەردوو زمانەکەدا بە دەردەکەوێ، هەروەها هەردوو زمانەکە ڕێگە بە دەرکەوتنی زنجیرەیەك دیارخەر (زیاتر لە یەك دیارخەر ) دەدەن، ڕیزبوونی کەرەسەکان لەو زمانەدا بە تەواوی جیاوازن. لە زمانی کوردیدا نیشانەی ناسیاوی فۆرمێکی بەندی هەیە و بەدوای ناوەکە دێت و جێناوی نیشانەی پێش دەکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا تێکەڵبوونی وێنەی (٤٨) کە لەگەڵ ڕیزبوونی سەرەوەی زمانی عەرەبی گونجاوە، لەگەڵ کوردی ناگونجێ، و ڕێگەی پێ نەدراوە.

٤٨- أ. هذا - ال - کۆڵان

بەڵام بەهۆی یەك سیستەمی ڕیزبوونی کەرەسەکان لە زمانی کوردی و تورکمانیدا ڕۆنانی سەرەوەیان یەك دەخاو نا هاوتایی دروست ناکات.

ب. بو کۆڵان.

ج. ئەو قۆیون - Ø.

بەهۆی ئەوەی جێناوی نیشانە لە زمانی تورکمانیدا پاشبەندی نیشانەی لەگەڵدا نییە، بۆیە ڕستەی (ب) لە (ج) گونجاوترە.

**٩. مەسەلە تیۆرییەکان.**

دەقە ئاخاوتنەکانی ئێمە ئەوە نیشان دەدەن کەوا هەندێ کۆتبەند هەن لە تێکەڵبوونی زمانی کوردی و عەرەبیدا ئازادی نادەن بە تێکەڵبوون، کە لە هەموو شوێنێك ڕوودات لەگەڵ یان بەبێ ڕستە. لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ کەوا پرنسیپی (c-command) یان شوێنکەوتن – dependency) کە شێوەکەی لە Ann-Marie Di Sciullo and others(1986)

داڕێژراوە ڕێگەیەکی زۆر دەگرێتەوە، ئەگەر هەموو ڕێگاکان نەبێ، بەرەو وەسفکردنی نزیکەی هەموو ئەو کۆتبەندانەی لە تێکەڵبوونی زمانی کوردی — عەرەبیدا جێبەجێ دەکرێ.

پرنسیپی دەسەڵات government یان c-command ناتوانێ پێشبینی شوێنی تێکەڵکردنەکان بکات، یان لێکدانەوەی شوێنی دەرنەکەوتنی تێکەڵبوونەکان. تێکەڵبوون لەو شوێنانە دەردەکەون، یان ڕوودەدەن، کەوا پەیوەندی حوکمکردن (دەسەڵات)ی تێدا دەرناکەوێ بەسەر کەرەسەکاندا. بەمەش نابێتە تێکەڵبوون لە نێوان ئەو کەرەسانەی لە ڕووی فەرهەنگەوە سەربەخۆن، لەو شوێنەی X دەسەڵاتی بەسەرەوە y یەوە هەیە.

هەردوو کەرەسەکە دەبێ هەمان زمانیان هەبێ، پرنسیپی حوکمکردن لە بابەتی c-commad دادەڕێژرێ، بە چاکی دەچێتە ناو دەیتاکانی ئێمەوە.

## ١٠ — ئەنجام:

ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەم ئەنجامانەی لێ دەکەوێتەوە:

(١) زمان تێکەڵکردن بە واتای تێکەڵکردنی دوو زار یان دوو زمان لەکاتی قسەکردندا دیاردەیەکی بڵاوە لەو کۆمەڵانەدا کە دوو زمان یان زیاتر تێیاندا بە کاردێ، بە تایبەتی لە ئاستی سینتاکسدا، هەرچەندە لە ئاستەکانی تری زمانیشدا دیاردەکە بەدی دەکرێ.

(٢) دیاردەکە لە ساڵەکانی ١٩٧٠ بە دواوە لە ئەوروپا بە تایبەتی لێکۆڵینەوەیەکی زۆری لەسەر کراوە و لە سێ لایەنەوە: لایەنی سۆشیۆ کە گوێ بە بەشدارەکانی قسە دەدات و بەدوای ئەو هۆکارانەدا دەگەڕێ کە دەبنە هۆی تێکەڵکردن، لایەنی سایکۆ کە گوێ بەو توانستەی قسەکەر

دەدات کە ئەم توانایەی تێدا دروست دەکات، لایەنی زمانەوانی کە لەو شوێنانە دەکۆڵێتەوە کە زمان تێکەڵکردن تێیاندا ئاساییە.

(٣) لە ساڵانی ١٩٨٠ بە دواوە بۆچوونێکی تر بۆ لێکۆڵینەوە لە زمان تێکەڵکردن هاتە کایە کە گوێی زیاتر بە زمان تێکەڵکردن دەدا لە ئاستی ئاخاوتنێکدا نەك ئاستی ڕستەدا: بەمەش چەندین راستیی تر لە بارەی دیاردەکەوە دەرکەوت.

(٤) ئەم لێکۆڵینەوەیە بە پشت بەستن بە دەیتای تێکەڵکردن لە نێوان کوردی و عەرەبی لە لایەك و کوردی و تورکمانی لە لایەکی تر، ئەو شوێنانە دیاری دەکات کە زمان تێکەڵکردن تێیاندا روو دەدەن لە ئاستی ئاخاوتن و لە ئاستی ڕستەدا.

(٥) لەهەمان کاتیشدا لێکۆڵینەوەکە دەری دەخات کە جیاکردنەوەی زمان تێکەڵکردنی مێتافۆری و تێکەڵکردنی بار لە یەکتری، جیاکردنەوەیەکی بێ سوودە و لەناو جۆرەکانی زمان تێکەڵکردنیشدا تەنیا جۆری ناوەکی و دەرەکی (لە سنووری دوو ڕستەدا) گرینگن.

(٦) زمان تێکەڵکردن لە لاوازی و بێ هێزی توانستی قسەکەر لە یەکێك یان لەهەر دوو زمانەکەدا سەرچاوە ناگرێ، بەڵکو چەندین ئەرکی کۆمەلأیەتی پێ جێبەجێ دەکرێ.

## سەرچاوەکان:

## بەزمانی ئینگلیزی:

1. Auer , P (1984). Bilingual Conversation. Amsterdam: John Benjamin.
2. Gumperz , j. (1982) Discourse Startegies. Cambridge: Cambridge university Press.
3. Lipski J.M (1978) Code-switching and the problem of bilingual competence in paradis.
4. Mclaughin , B.(1987). Theories of Language learning. London: Edward Arnold.
5. Pfaff , C. (1979) ' constraints on Language mixing: intrasentcntial cod-switching and borrowing in Spanish / English. Language 55: 291 – 318.
6. Poplack , S. (1980) ' Sometimes I'll start a sentence dith Spanish: Toward a typology of code-switching linguistics: 18: 581 – 618 )
7. Stroud , C. (1992). ' The problem of intention and meaning in code-switching Text 12 , 127-155.

**سەرچاوە کوردییەکان**

عەلائەددین سەجاددی: ٢٠٠٥ ـ چاپخانەی معارف بەغداد

# الخلاصة

## المزج اللغوي في الكلام


ب. د. محمد معروف فتاح    د. صباح رشيد قادر




ظاهرة المزج اللغوي بين لغتين او اكثر هي من الظواهر الواسعة الانتشار، وخصوصا ظهورها في المحادثات اليومية، وقد كرست خلال العشر السنوات الماضية بحوث جمة في هذا المضمار، وفي أطر علم اللغة الاجتماعي، وعلم اللغة النفسي والبحوث اللغوية وجلها تؤكد على الوجه الوصفي او الوجه النظري للظاهرة. وتعد هذه النقطة دليلا كبيرا على ان المزج اللغوي عبارة عن عموميات لغوية ضمن سلوك التكلم بأكثر من لغة. عند استعمال عدد من اللغات او بالاحرى لغات مختلفة في موقف كلامي معين، يجب الاعتماد على رصد الآلية الداخلية للتحاور ضمن سياقات لغوية مختلفة. المبتغى الرئيسي لهذا البحث يكمن ضمن تكوين حالة لطريقة التحليل الكلامي في المزج اللغوي والذي قدم من قبل (ئوور). خلال العشرين السنة الماضية. هذا البحث على نقيض الفرضيات الواسعة الانتشار يظهر هذه الظاهرة كاختيار غير منتشر يمكن التعامل معها ضمن موضوعات تحليل الكلام او المحادثة. تحليل المحادثة يؤخذ هنا للمزج اللغوي من بيانات وحقائق مأخوذة من اللغات الكردية والعربية والتركمانية، هذا التحليل يوحي الى حلقة موسعة للوظائف الداخلية للمزج اللغوي، والذي وان لم يكن كامل المعنى اجتماعيا، ولكن له انسجام كلامي.

# Abstract

## Code – Switching in Conversation

***Prof. Dr. Muhammad M. Fattah & Dr. Sabah R. Qadir***

Code – switching is a widespread phenomena in bilingual and multilingual communities, Particularly in naturally occurring every day conversations, and it has been studied for several decades using various linguistic approaches within the frameworks of sociolinguistics, psycholinguistics and grammatical studies, all of which have put greater emphasis either on descriptive or on theoretical aspects of the phenomenon. These seems to be, at this point, more and more evidence that code – switching is a language universal in the behaviour of multi – lingual speakers, I, e. to use several languages or language varieties in the course of a conversation is based on conversation – internal mechanisms observable in various social contexts all over the world.

The main purpose of the paper is to make a case for the conversation analytic approach to code – switching which was pioneered by Auer over twenty years ago. The paper shows that contrary to a widespread assumption, code – switching as an unmarked choice can be dealt with in terms of conversation analysis. The conversation analysis taken here to code – switching relies on data from Kurdish, Arabic and Turkmani varieties such an analysis reveals a wide range of local functions of code – switching, which ,even it, not socially meaningful, do have communicative relevance.

# سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بە کورد لە کەرکووك لە ساڵانی دوای ڕاپەڕیندا

## توێژینەوەیەکی

## شیکاری لە بەڵگەنامە فەرمییەکاندا

**پ. ی. د. سەعدی عوسمان هەروتی**

کۆلیژی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

### پێشەکی

بەڵگەنامەکان بە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی زۆر گرنگ دادەنرێن بۆ نووسینەوەی مێژووی هەر میللەت و وڵاتێك، لەبەر ئەوەی ئەم بەڵگەنامانە بەدیارخەری سیاسەت و بڕیارەکانی حکومەت و هەروەها شایەتحاڵی هەڵوێستی خەڵك و دانیشتوانن. یان بە واتایەکی تر تۆماری ڕەوشی ڕووداوەکانی ڕابردوون، بۆیە زۆر جار دەگوترێت: (مێژوو بێ بەڵگەنامە هەبوونی نابێت).

بڕێکی یەکجار زۆر بەڵگەنامەی فەرمیی حکومەتی عیراق لەگەڵ ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ کەوتە بەردەستی خەڵکی عیراق بەگشتی و کورد بە تایبەتی. بەهەمان شێوە لە ئەنجامی ڕووخانی حکومەتی بەعس لە ٢٠٠٣/٤/٩ زۆربەی هەرە زۆری بەڵگەنامەکانی حکومەت ئاشکرا بوون و پەردەیان لەسەر کردارە داپلۆسێنەرو ستەمکارییەکانی بەعس هەڵماڵی. بە تایبەتی کە بەشێکی ئەم بەڵگەنامانە لەم ساڵانەی دوایی بڵاوکرانەوە.

هەرچەندە هەریەکێك لەم بەڵگەنامانە سەلمێنەری درندایەتی حکومـەتی بـەعس و شایەتحاڵی ڕووداوێك یان حاڵەتێکی چەوساندنەوەن کە لە هەمبەر کورددا ئـەنجام دراوە، بەڵام دەبێ ئەم بەڵگەنامانە بە کۆمەڵ بخرێنە بەر شـیکردنەوەو توێژینـەوە، وە بە چاوێکی زانستییانەی مێـژوویی سـەیر بکـرێن بـۆ ئـەوەی بتـوانرێ وێنەیـەکی گشتی سیاسەتی بەعس بکێشرێت و هـەموو لایـەن و ڕەهەنـدەکانی ئـەم سیاسـەتە بەدیار بخرێت و لەهەمان کاتیشدا بە بەڵگەی فەرمی ئـەم سـتەمکارییانە بـسەلمێنن کە بەرامبەر کورد ئەنجامدراون، بۆ ئەوەی مافـەکان بـەدیار بخـرێن و هـەوڵ بـدرێت قەرەبوو بکرێنەوەو دەرەنجامە خراپەکانی سیاسـەتی بـەعس ڕەش بکرێنـەوە. بـە تایبەتی ئەم لایەنانەی کە زیانیان لە ستراتیژی نەتەوەیی کورد داوە.

ئەم مەسەلەیە هۆکار و ئامانجی ئەم توێژینەوەیـە پێکـدێنێت کـە هـەوڵ دەدات سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی کورد لـە کـەرکوك لـە مـاوەی دوای ڕاپـەڕینی ئـاداری ساڵی ١٩٩١ دا بەدیار بخات و ئەم شێواز و هەنگاوانە ڕوون بکاتەوە کـە بـە هۆیـەوە حکومەتی بەعس ئەم سیاسەتەی پیادە دەکرد. ئەمـەش لـە ڕێگـەی تـاوتوێکردن و شیکردنەوەی ئەم کۆمەڵـە بەڵگەنامەیـەی کـە وێنـەی دەقـە ڕەسـەنەکانیان لەگـەڵ دەقـی وەرگێڕدراویـان بـۆ سـەر زمـانی ئینگلیـزی لـە لایـەن مەڵبەنـدی ڕێکخـستنی کەرکووکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (ی. ن. ك) لەژێر ناونیشانی:

(Ethnic cleansing documents in Kurdistan-Iraq, part 2)

لە ساڵی ٢٠٠٤ لە کەرکوك بڵاو کراونەتەوە.

هەرچەندە بابەتی (سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی کورد) لەم ساڵانەی دوایی چەندین توێژینەوەو کتـێبی لەسـەر نووسـراوە، بـەڵام دەتـوانین بڵـێین تـەنیا بەشێکی ئەم نووسـینانە بەڵگەنامـە و سەرچـاوەی ڕەسـەنیان بـەکارهێناوە، هەندێکیشیان لە لایەن کەسـانی نائـەکادیمی نووسـراون و مـۆرکی ئـەدەبی و

ڕۆژنامەییيان پێوە دیارە، هەروەها بەشێکی کەمی ئەم توێژینـەوەو کتێبانـە باسی ماوەی دوای ڕاپەڕین دەکەن.

بایەخی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە کە هەر لە ڕێگەی بەڵگەنامەکانی خودی حکومـەتی بەعـسەوە دەیـەوێ سیاسـەتی ئـەم حکومەتـە لـە کـەرکوک ڕوون بکاتەوە، ئەمە لە لایـەك لـە لایـەکی تـریش ئـەم توێژینەوەیـە تـەرخان کـراوە بـۆ ماوەی دوای ڕاپەڕین کە وەك گوتمان زۆر بە کەمی توێژینەوەی لەسەر کراوە.

## پاکتاوی ڕەگەزی ... چەمك و پێناسە:

بەر لەوەی پاکتاوی ڕەگەزی –کە دەستەواژە کوردییەکـەی ( **Ethnic cleansing**)ـە– پێناسە بکەین و چەمکەکەی دیـاری بکـەین، وا پێویـست دەکات زاراوەی (جینۆساید) بناسێنین، چونکە پەیوەندییەکی بەتین لـەنێوان ئەم دوو زاراوەیەدا هەیە وەك دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

جینۆساید لـە بنەڕەتدا لـە دوو وشە پێکهاتووە:

١– (**Genos**) کە وشەیەکی یۆنانییە و بە واتای (ڕەگەز) یان (ڕەچەڵەك) دێت.

٢– (**Caeder**) کە وشەیەکی لاتینیە و دەکاتە (کوشـتن) یـا (فەوتانـدن) و (قڕکردن).

کەواتە بە لێکدانی هەردوو وشەکە زاراوەکانی (جینۆساید– Genocide)و (فەوتاندنی بنەچە)مان دەست دەکەوێت [(١)]، کـە هاوکـات لـەگەڵیانـدا زاراوەکـانی (قڕکردنی ڕەگەزی) و (لەناوبردن بە کۆمەڵ) یش زۆر جار بەکاردێن.

---

(١) د. مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر ڕۆشنایی یاسای نێودەوڵەتانـدا، چ٤، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧، ل١٧.

له ماددەی دووەمـی پەیماننامـەی (قەدەغـەکردنی تـاوانی جینۆسـاید و سـزادانی ئەنجامـدەرانی) کـە ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە ١٩٤٨/١٢/٩ پەسندی کردووە. هاتووە کـە: (جینۆسـاید هەریـەکێك لـەو کردارانەی خوارەوە دەگرێتـەوە کـە بـە مەبەسـتی لـەناوبردنی تـەواوی یـان بەشێکی گرووپێکی نەتەوەیی یان ڕەگەزی یان ئایینی ئەنجام درابێت:

١- کوشتنی ئەندامانی ئەم کۆمەڵە.

٢- گەیاندنی زیانی جەستەیی و دەروونی ترسناك بە ئەندامانی ئەم گرووپە.

٣- دانانی ئەم کۆمەڵەیە بە ئەنقەست لە ژێر بارودۆخێکی سـەختدا کـە ببێتـە هۆی فەوتاندنی هەموو یا بەشێکی.

٤- دروستکردنی تەگەرە لە بەردەم منداڵبوون لەم کۆمەڵەیەدا.

٥- ڕاگواستنی منداڵ بەزۆر لەم کۆمەڵەیە بۆ کۆمەڵێکی تر) [٢].

بێگومان هەموو ئەم جـۆرە تاوانانـە لـە لایـەن حکومـەتی بەعـسەوە لـە کوردستان ئەنجام دراون و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤیش ئاماژەیان بۆ کردووە. لـە ڕاپـۆرتێکی ڕێکخـراوی (Middle East Watch)ی سـەر بـە (Human Rights Watch) کە سـاڵی ١٩٩٣ دەرچـووە ئامـاژە بـەوە کراوە کە شاڵاوەکانی ساڵانی ١٩٨٧-١٩٨٩ی ڕژێمی عیراق لەم بوارانەی خوارەوە پێشێلی مافی مرۆڤیان کردووە:-

١- لەناوبردنی کۆمەڵێکی زۆری کورد و شوێن بزرکردنی دەیەها هەزاریان، لە نێویاندا ژمارەیەکی زۆری ئافرەت و منداڵ.

---

[٢] د. جبار قادر، قضايا كردية معاصرة/ كركوك -الانفال- الكرد وتركيا، ط١، منشورات ئاراس، اربيل ٢٠٠٦، ص١٣٢.

٢- بەكارهێنانی فراوانی چەكی كیمیاوی لە شاری هەڵەبجە و ژمارەیەك گوندی كوردی و كوشتنی هەزارەها هاووڵاتی كورد لە نێویاندا ئافرەت و منداڵیش.

٣- سووتاندن و كاولكردن و تێكدان و پاكتاوكردنی زیاتر لە (٢٠٠٠) گوندی كوردی و ژمارەیەكی زۆری ناحیە و قەزاكان.

٤- تێكدانی تەواوی دامەزراوە مرۆییەكان لە لایەن ئەندازیارانی لەشكری عیراقی، لە نێویاندا قوتابخانە و مزگەوت و زۆر شوێنی تر.

٥- تالانكردنی ماڵ و موڵكی دێهاتییە كوردەكان لە نێویشیاندا مەڕ و ماڵاتەكانیان.

٦- دەست بەسەرداگرتنی زەویوزاری ژمارەیەكی زۆری كورد لەسەر بنەمای ئەوەی كە كەوتوونەتە ئەو شوێنانەی كە پێیان دەگوترا (زەوی حەرامكراو). بۆ زانین بەشێكی گەورەی ئەم زەوییانە شوێنی حەوانەوەی خەڵكی ئەم گوندانە بوون.

٧- كاولكردنی ژێرخان و ئابووری میللەتی كورد[٣].

كەواتە تاوانی جینۆساید لە چوارچێوەیەكی فراواندا خۆی دەبینێت و مەرج نییە تەنیا كوشتن یان لەناوبردن بگرێتەوە، بەڵكو هەندێ سیاسەت و ڕەفتار دەگرێتەخۆ كە دەخرێنە خانەی چەوساندنەوەی نەتەوەیی. بە گشتی دەتوانین بڵێین جینۆساید هەموو ئەم شێوازانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

---

[٣] بڕوانە دەقی ڕاپۆرتەكە لە: گۆڤاری (پەیڤین) ژمارە (٢) سلێمانی، ئۆكتۆبەری ١٩٩٧، ل٢٧٠-٢٩٧، لە وەرگێڕانی: ڤیان عبدالستار طاهر.

أ- جینۆسایدی فیزیکی (جەستەیی): کوشتن بە هەموو شێوەکانی دەگرێتەوە چ گوللە بارانکردن بێت یان لە سێدارەدان یان بە کۆمەڵ کوشتن و بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ لە کاتی هێرش و کردەی سەربازیدا.

ب- جینۆسایدی بایۆلۆجی: بریتییە لە بەربەستکردنی هەر کۆمەڵە مرۆڤێك لە زیادبوون و پەرەسەندن، وەك لە یەکتردابڕینی ژن و پیاو بۆ ماوەی درێژ و نەهێشتنی منداڵبوون.

جـ- جینۆسایدی کولتووری- نەتەوەیی: وەك قەدەغەکردنی زمانی نەتەوەیی و ڕۆشنبیری و شێواندنی مێژوو، وە لە نێوبردنی تایبەتمەندی نەتەوەیی و نەهێشتنی هاوبەندی نێوان خەڵك، هەروەها وێرانکردنی شوێنەوارە مێژووییەکان.

د- جینۆسایدی ئابووری، یان (وێرانکردنی ئابووری): واتا وێرانکردنی سامان و سروشت و بەروبوومی ناوچەکان، تالآنکردنی ماڵ و سامانی خەڵك. هەروەها گەمارۆی ئابووری بۆ برسی کردنی خەڵك. کە ئەم کردارانە هەموویان دەبنە هۆی لەناوبردنی مرۆڤ بە شێوەی لەسەرخۆ[٤].

لەئەنجامی ئەم زانیارییانەی سەرەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە لەهەموو بارەکاندا جینۆساید ڕووداوێکی کتوپڕی هەڕەمەکی نییە بەڵکو پرۆسەیەکی نەخشە بۆکێشراو و ئامانجدارە. ئەم ئامانجەش لەبنەڕەتدا ئامانجێکی شۆڤینستانەی توندوتیژە کەلەلایەن گرووپێکی دەسەلآتدارەوە لەهەمبەر گرووپێك یان ڕەگەزێك یان نەتەوەیەکی ژێردەستە هەوڵی بەدیهێنانی دەدرێ، بۆ ئەوەی هەبوونی ئەم گرووپە (یان: نەتەوە و ڕەگەزە) لەناوچەیەك یان

---

[٤] د. مارف عومەر گوڵ، س.پ، ل٢٠-٢١.

شوێنێکی دیاریکراودا نەهێڵن و بیسڕنەوە، تا لە کۆتاییدا گرووپ (یان: ڕەگەزو نەتەوە)ی خۆیان لەوێ بالادەست بێ و بەتەنیا بمێنێتەوە. بێگومان دەسەڵاتدارانی بەعس لە عیراقدا کە سیاسەتی قڕکردنیان لەدژی کورد پیادە کرد تەنیا لەبەر ئەوە نەبوو کە ڕقیان لە کورد دەبوو، بەڵکو دەیانویست لەکۆتایی پرۆسەکەدا تەنیا ڕەگەزی عەرەب لەعیراقدا هەبوونی هەبێت وکورد وەکو ڕەگەز و نەتەوە لەناوبچێت (وەك لە لاپەڕەکانی دواتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە). بێگومان ئەمەش ئامانجی سەرەکی سیاسەتی (پاکتاوی ڕەگەزی)یە، بۆیە دەتوانین بڵێین کردارەکانی جینۆساید لەخزمەتی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزیدایە و شێواز و ڕێگایەکە بۆ بەئامانج گەیاندنی، هەروەکو خودی ئەم سیاسەتەش بەو تاوانانەی کە لەخۆی دەگرێ و لەچوارچێوە گشتییەکەی دەچێتە خانەی تاوانی جینۆسایدەوە.

لێرەدا ئەوە ماوە بڵێین کە حکومەتی عیراق لە کوردستاندا لە پاڵ سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی سیاسەتێکی تریشی پەیڕەو دەکرد کە هەردووکیان وەك دوو ڕووی یەك دراو وابوون. ئەویش سیاسەتی بە عەرەبکردن بوو کە بریتییە لە کرداری گۆڕینی نەژاد و ناسنامەی نەتەوەیی، لە نەتەوەیەکی ناعەرەبییەوە بۆ نەتەوەی عەرەب، ئەم کردارەش تەنیا مرۆڤەکان ناگرێتەوە، بەڵکو جوگرافیاو کولتوور و ئادگارە کۆمەڵایەتییەکانیش دەگرێتەخۆ[٥]. ڕژێمی بەعس سیاسەتی بە عەرەبکردنی وەك ئامرازێك و لە هەمان کاتیشدا وەك ئامانج دادەنا، چونکە لە لایەك بە هۆی ئەم سیاسەتە سیماکانی نەتەوەیی

---

[٥] عەبدال نوری عەبدال، کلتوور و ناسیونالیزم و بە عەرەبکردن، چاپخانەی هاوار، دهۆك ٢٠٠٦، ل١٣.

کوردی لە ناودەبرد و لە لایەکی تر پاکتاوکردنی ڕەگەزی کورد دەبووە هۆی زاڵبوونی سیمای عەرەبی لەو شوێنانەی کە مەبەست بوون. واتە ناوچەکانی کوردستان. هەر بۆیە ئەم ڕژێمە دەستبەرداری ئەم سیاسەتەی نەبوو تەنانەت دوای ڕاپەڕینی ئاداری ساڵی (١٩٩١)یش وەکو لێرە بەدوا بۆمان بەدیار دەکەوێت.

## شێوازەکانی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بەکورد لە کەرکووکدا:

لە ئەنجامی ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١دا هەلومەرجێکی نوێ لە عیراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی هاتە کایەوە، کە تیایدا حکومەتی بەعس وەك ڕژێمێکی شکست خواردووی وڵات وێران لە جەنگی دووەمی کەنداو و وەك دەسەڵاتێکی نیمچە سەرکەوتوو بەڵام ماندوو لە پرۆسەی سەرکوتکردنی ڕاپەڕین هاتە دەرەوە. هاوکات لەگەڵ ئەمەدا کێشەی کورد لە عیراقدا پێی نایە قۆناغێکی نوێ، بە تایبەتی کە بەڕێوەبەرایەتییەکی کوردی خۆجێیی لەو ناوچانەی کوردستان دامەزرا کە دەسەڵاتی حکومەتیان لێ بەدەر نرابوو. وە مەسەلەی کورد سۆز و پشتیوانییەکی نێودەوڵەتی بەدەست هێنا بە جۆرێك دەتوانین بڵێین لە ئاستی کێشەیەکی نێوخۆییدا نەماو گەیشتە ئاستێکی جیهانی[٦].

سەرەڕای ئەم گۆڕانکارییە گرنگانە کە هاوکات لەگەڵیدا فشاری ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لەسەر حکومەتی سەدام بەردەوام بوو بۆ داماڵینی لە

---

[٦] لەم بارەیەوە بڕوانە: کۆمەڵێك لە نووسەران، گەلێکی پەژموردە و نیشتیمانی پەرت، سەرپەرشتیار: ژیرارد چالیاند، و: م. گۆمەیی و أ. حەوێزی، سوێد ١٩٩٨، ل٤١٦–٤١٧.

چەکی کۆکوژ، بەڵام ئەم حکومەتە دەستبەرداری سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی نەبوو لەو ناوچە کوردیانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا مابوونەوە. لەبەر ئەوەی ئەم سیاسەت و ڕەفتارانە بەشێکی گرنگی ستراتیژی ئەم حکومەتەیان پێکدەهێنا، وە لە پەیڕەو و پڕۆگرامی حیزبی بەعسی دەسەڵاتداردا بە توندی ڕەگوڕیشەی داکوتابوو[٧].

دەڤەری کەرکوك لە نێو ئەم ناوچە کوردییانە دابوو کە لە ماوەی دوای ڕاپەڕین بە شێوەیەکی دڕندانە دووچاری سیاسەتی بە عەرەبکردن و شاڵاوی پاکتاوی ڕەگەزی بۆوە. ئەم دەڤەرە لە ئەنجامی هەندێ فاکتەری ئابووری (دەوڵەمەندی بە سامانی نەوت)و ستراتیژی لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینیش گورزی هەرە گەورەی ئەم سیاسەتەی بەرکەوتبوو، کە لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا گەیشتە ترۆپك[٨].

سیاسەتی ناوبراو لەم قۆناغەشدا خاوەن سیماو تایبەتمەندی خۆی بوو، ئەگەرچی بە گشتی لە ئەنجامی هەمان هۆکارو بۆ هەمان ئامانج پیادە دەکرا کە بریتی بوون لە تواندنەوەی میللەتی کورد و سڕینەوەی مۆرکی کوردایەتی لە ناوچەکانی کوردستان. ئەمەش لە ڕێگەی کردارێکی گشتگیر و هەمەلایەنە کە دەسەڵاتدارانی بەعس خۆیان زاراوەی (تەعریب = بەعەرەبکردن)یان بۆ بەکاردەهێنا، تا لە ئابی ساڵی ٢٠٠٠ خۆیان شەرمیان لەم زاراوەیە کرد (یان لە ڕاستیدا هەستیان بە هەڵەی خۆیان کرد) بۆیە لە جیاتی ئەمە وشەی

---

[٧] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.جبار قادر، م.س، ص١٣١ ومابعدها، هەروەها: سۆزان کەریم مستەفا، بەعسیزم و کورد، سلێمانی ٢٠٠٧، ل١٠٩ و دواتر.

[٨] بڕوانە ڕاپۆرتی MEW لە: گۆڤاری (پەیڤین) ژ (٢)، ل٢٧١، ٢٧٣.

(تطویر= پەرەپێدان)یان بۆ بەکارهێنا[9]. پرۆسەی پاکتاوی ڕەگەزی لەم قۆناغەدا لە لایەك بەرتەسكتر بوو (بە حوكمی ئەوەی ناوچە كوردییەكانی ژێر دەسەلاتی حكومەت كەمتر ببۆوە) [10]، وە لە لایەكی تر شالاوی قڕكردنی هاوشێوەی ئەنفالی بەخۆوە نەبینی. بەلام لە هەمان كاتدا پرۆسەكە لەم قۆناغەدا زۆر خێراتر و بێ شەرمانەتر بوو هەروەها هەمە لایەنەش بوو (بێجگە لە چەند ساڵێكی كەمی دوای ڕاپەڕین كە لەم بوارەدا كەمێك نەرمی پیشان درا وەك بەرپرسێكی بەعس خۆی ئاماژە بەوە دەكات)[11]. مەبەست لەم هەمە لایەنییە ئەوەیە كە سیاسەتی پاكتاوی ڕەگەزی ئەم قۆناغە لە كەركووك بە چەندین شێواز ئەنجامدرا وەك لێرە بەدوا هەوڵ دەدەین لە ڕێگەی تاوتوێكردنی بەڵگەنامەكانی حكومەتی بەعس بە دیاری بخەین:

### ١–شێوازی كارگێڕی:

لە سالانی پێش ڕاپەڕین حكومەتی بەعس چەندین گۆڕانكاری كارگێڕی لە ناوچەكە ئەنجام دا كە مەبەست و ئامانجی شۆڤێنییان لە دواوە بوو، وەك ئەوەی هەندێ ناوچەیان لەو مەڵبەندە كارگێڕییە دەكردەوە كە

---

[9] Ethnic Cleansing Documents in Kurdistan-Iraq, part 2, published by: patriotic union of Kurdistan-Kirkuk organization center, Kirkuk 2004, p. 160.

[10] مراد حەكیم محەمەد، ئاكامە كۆمەلایەتییەكانی سیاسەتی ڕاگواستنی كورد لە عێراق لە سەردەمی بەعسدا، سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیژی كوردستان، سلێمانی ٢٠٠٤، ل١٥٨.

[11] بڕوانە دەقی نووسراوێكی ئەم بەرپرسە لە: Ethnic Cleansing…

دەیانویست ئاکاری نەتەوەیی بگۆڕن، بۆ ئـەوەی ڕێـژەی دانیـشتووانی کـورد تیایدا کەم بێتەوە. لـە کردارێکی پێچەوانەشدا لـە هەنـدێ بـاری تـردا چـەند گونـدێك یـان شارۆچـکەیەکی کوردیـان دەخـستە سـەر ئـەو مەڵبەنـدە کارگێڕییەی کە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی و پرۆسـەی بەعـەرەبکردن تیایـدا قۆناغێکی زۆری بڕیبوو، بۆ ئەوەی ئـەم گونـد و شارۆچـکانەش ڕووبـەڕووی هەمان چارەنووس ببنەوە[١٢]. بۆیە دەتوانین بڵێین گۆڕانکارییە کارگێڕییـەکان وەك ئامرازێك بۆ سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی بەکاردەهێنرا.

دیارە لـە ماوەی دوای ڕاپـەڕینیش ئـەم سیاسـەتە هـەر بـەردەوام بـوو، بەڵکو بە شێوەیەکی فراوانتریش پیادە کرا، وە دەبێ بایـەخێکی زیاتریـشی پـێ درابێ، بە جۆرێك ئەم بڕیارانە لـە شـێوەی مەرسـومی کۆمـاری و لـە لایـەن خودی (سەدام حوسێن)ی سەرۆکی ڕژێمەوە دەردەچوون. ئەوەتا لە بڕیارێکی لەم شێوە لە بەرواری (٢٥)ی ئەیلولی ١٩٩٦دا (٣٨) گوند ـ کـە تـا ئـەو کاتە بە فەرمی سەر بە قەزای هەولێر بوون لـە پارێزگـای هـەولێردا– خرانـە سەر ناحیەی دوبز (الـدبس)ی سەر بە پارێزگای کەرکوك (التـأمیم) کـە لـە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەنـدی دابـوو وە لـە ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی ئـەژمار نەدەکرا، گرنگترین ئەم گوندانە ئەمانە بوون: (سەر بەشاخ، جاستان، شەناغە، سەرگەڕان، دەرماناو)[١٣]. دواتریش بـە بڕیـارێکی ئەنجومـەنی سـەرکردایەتی شۆڕش (مجلس قیادة الثورة) کـە لـە بـەرواری ٢٠/١٠/٢٠٠٠ لـە لایـەن

---

[١٢] بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: د.خلیل اسماعیل محمد، البعد القومي للتغییرات في الحدود الاداریة لمحافظة کرکوك، منشورات مجلة کاروان، أربیل ١٩٩٧.

[١٣] Ethnic Cleansing…, p.23.

خودی (سەدام حوسێن)ەوە دەرچوو ناحیەی دوبز کرایە قەزایەك لە پارێزگای کەرکووك و گوندی (سەرگەڕان)یش کرایە مەڵبەندی ناحیە لەم قەزایەدا، وە ناوی ناحیەی (القدس)ی لیٚ نرا کە پێشتر هەڵوەشێنرابۆوە[١٤].

جێگەی سەرنجە ئەم سی و هەشت گوندەی کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد دیارە زۆربەیان لە ناوچە کوردییە ئازادکراوەکان بوون بەڵام لە ئەنجامی شاڵاوە سەربازیەکەی ١٩٩٦ حکومەتی بەعس خستبوونیەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە بەم شێوەیە لەگەڵ مەڵبەندە کارگێڕییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی گرێدران.

لە بەڵگەنامەیەکی تردا کە فەرمانێکی نهێنی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمارەو بە ژمارە {ب (ق/٣٦٤٣٨)}و لە بەرواری (١٩٩٨/١٢/٢٤)دا دەرچووە، بڕیاردراوە بە گێڕانەوەی ناحیەی (قەرەحەسەن)ی هەڵوەشاوەو گۆڕینی ناوەکەی بۆ ناحیەی (أم المعارك). ئەم ناحیەیەش کە دەبوو سەر بە قەزای ناوەندی کەرکووك بێت (٤٠) گوندی پێوە گرێدرابوو، لە نێویاندا گوندەکانی (یارمجە، لەیلان، عەلیاوە، چیمەن، ساڵەیی، شوانە) [١٥].

جێگەی تێبینییە بەشی هەرە زۆری ئەم گوندانە لە کۆتایی هەشتاکاندا کەوتبوونە بەر سیاسەتی ڕاگواستن و ئەنفال و خاپوورکردن[١٦]. ئەوەتا بە پێی ئامارێك بۆمان دەردەکەویٚ کە تەنیا لە ساڵی ١٩٨٨ دا (١٥) گوند لە ناحیەی قەرەحەسەن وێران کراوە[١٧]. دواتریش ناحیەی ناوبراویان

---

(١٤) Ibid, p. 28.

(١٥) Ethnic Cleansing…, p. 25.

(١٦) بڕوانە ڕاپۆرتی MEW لە: گۆڤاری (پەیڤین) ژ (٢)، ل٢٩٢.

(١٧) مراد حەکیم، س.پ، ل١٥٣.

هەڵوەشاندبۆوە بۆ ئەوەی ئەم ناوچەیە لە کارگێڕی فەرمی دابڕن. بەڵام دیارە لە ساڵانی دواتر لە چوارچێوەی سیاسەتی جێنشینکردنی هۆزە عەرەبەکان لە دەوروبەری کەرکووك ئەم ناوچەیان ئاوەدان کردۆتەوە[١٨]. بۆیە سەرلەنوێ حکومەت ئەم ناحیەیەی دامەزراندۆتەوە.

## ب- گۆڕانکاری دیمۆگرافی- ئێتنۆگرافی:

گۆڕانکاری کردن لە باروودۆخی دیمۆگرافی و ئێتنۆگرافی ناوچەکانی کوردستان یەکێك بوو لە بنەما سەرەکییەکانی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی کە حکومەتی بەعس لە هەمبەر کورد پیادەی دەکرد. بە هۆی ئەم گۆڕانکارییانە ڕژێم دەیویست مۆرکی کوردایەتی لە ناوچەکانی کوردستان بەرەبەرە بسڕێتەوە تا لە ئاکامدا میللەتێك بە ناوی کورد لەسەر ئەم خاکەدا هەبوونی نەمێنێت و لە شوێنی ئەو ڕەگەزی عەرەب و کولتوورەکەیان زاڵ بێت. لە ئەنجامی چەند هۆکارێك- کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد- ئەم سیاسەتە لە کەرکووکدا بە شێوەیەکی کاریگەرانە جێبەجێ دەکرا، بۆیە مەسەلەی موڵکداریەتی خانووبەرە (عقارات) لەم شارەو دەوروبەریدا ڕەهەندێکی زۆر هەستیاری وەرگرتبوو لای دەسەڵاتدارانی حیزبی بەعس، بە جۆرێك (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) کە سەدام حوسێن سەرکردایەتی دەکرد لە (١٩٩٣/٦/٧) دا بڕیاری ژمارە (٩٧)ی دەرکرد بۆ ئەوەی نەهێڵێ هیچ کردارێکی گواستنەوەی موڵکداریەتی خانووبەرە لە کەرکووك و دەوروبەریدا

---

[١٨] د.خليل اسماعيل محمد، مؤشرات سياسة التعريب والتهجير في اقليم كردستان العراق، منشورات مكتب الفكر والتوعية، سليمانية ٢٠٠٣، ص٢٦.

بێ ڕەزامەندی خـودی پارێزگـاری کـەرکووك ئـەنجام بـدرێت[19]. بێگومـان ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە لەم ڕێگەیەوە دەستکاری باری دیمۆگرافی و ئێتنـۆگرافی دەڤەرەکە بکەن. ئەم ئامانجەش بە شێوەیەکی گشتی بە چەند ڕێگەیـەك هـەوڵی بۆ دەدرا کە ئەمانە بوون:

### ١- ڕاگواستنی کورد:

لە پێناو کەمکردنەوەی ڕێـژەی دانیـشتووانی کـورد لـە کەرکووکـدا حکومەتی بەعس لە ساڵانێکی زووەوە دەسـتی دابـووە سیاسـەتی ڕاگواسـتنی کورد لەم دەڤەرەدا، ئەوەتا بەڵگەنامەیەکی فەرمی ئاماژە بەوە دەکات کـە لـە ماوەی جەنگی عیراقی- ئێرانیدا ژمارەیەکی گـەورەی کـوردان لـە ناوەنـدی شاری کەرکووك و هەروەها ناوچەکانی شوان و قەرەحەسەن و قادرکەرەم بۆ هەردوو پارێزگای هەولێر و سـلێمانی ڕاگـوێزران، بـەڵام سـەرەڕای ئەمـەش هێشتا ڕێژەی کوردان لە شاری کەرکووك بەر لـە ڕاپـەڕین دەگەیـشتە ٤٠٪ وەك لە هەمان بەڵگەنامەدا هاتووە[20].

لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕین و دووبـارە داگیرکردنـەوەی کـەرکووك حکومەتی ناوبراو بە شـێوەیەکی خێراتـرو بـەربڵاوتر ئـەم سیاسـەتەی پـەیڕەو

---

[19] بڕوانە دەقی بڕیارەکە لە: Ethnic Cleansing…, p. 53.

[20] بڕوانە دەقی ئەو ڕاپۆرتەی کە لە ساڵی ١٩٩٦ پێشکەش بە لێژنەی باکوور کراوە لە: (Ibid, p.82) وە بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د. مارف عومەر گوڵ، س.پ، ل٣١، ٣٤، ٥٠، هەروەها: مراد حەکیم، س.پ، ل١١٦ و دواتر.

کرد[٢١]، هەروەکو لــە بەڵگەنامــە فەرمییــەکانی ئــەم ماوەیــەدا بۆمــان ڕوون دەبێتەوە. هەر ئەم بەڵگەنامانە بۆمان بەدیاردەخەن کە دەسەڵاتداران بــە بیــانوو و هۆکاری جۆراو جــۆر دانیــشتووانە کوردەکــانی کــەرکووك و ناوچــەکانی دەوروبەریان ڕادەگواست، یان دەتوانین بڵێین لەسەر هەندێ بنەمای دیاریکراو کە ئەوان ناویان دەنا (ضوابط) ئــەو خێزانــە کوردانــەیان دیــاری دەکــرد کــە کرداری ڕاگواستن دەیانگرێتەوە[٢٢].

لە سەرەتادا دەبێ ئاماژە بە ڕووداوی (کــۆڕەو) بکــەین کــە بــە هــۆی سەرکوتکردنی ڕاپەڕین و دووبارە داگیرکردنەوەی زۆربەی شار و ناوچەکانی کوردستان ڕووی دا و لە ئەنجامدا هەزارەها خێزانی کورد لە ترسی دڕندایەتی بەعس ماڵ و خانووی خۆیان بە جێهێــشت و بــەرەو ســنوورەکان ڕایــانکرد. چونکە حکومەتی بەعس ئەم دەرفەتەی قۆستەوە و ڕێگەی نــەدا زۆربــەی ئــەو کوردانەی کە لە ئەنجامی کۆڕەوەکە لە کەرکووك هەڵاتبوون بگەڕێنەوە ســەر ماڵ و حاڵی خۆیان، هەرچەندە سەرکردایەتی کورد لە دانووساندنەکانی ئــەو ساڵەدا داوای لە حکومەت کردبوو کە دەست لەم کارە هەڵگرێ[٢٣].

بە وردبوونەوە لەم بەڵگەنامە نێوبراوانە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەشــێکی ئەم خێزانە کوردانەی لە کەرکووك ڕاگوێزراون لەوانە بــوون کــە لــە لایــەن دەسەڵاتدارانی بەعسەوە (ئاماژەی ئاسایش= مؤشرات أمنية)یان لەســەر بــوو،

---

[٢١] د.خليل اسماعيل، مؤشرات...، ص٦٣.

[٢٢] بڕوانە چەند بەڵگەنامەیەك لە: Ethnic Cleansing..., p. 193,239.

[٢٣] د.نوري الطالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، لندن ١٩٩٥، ص١٣٦، هەروەها: مراد حەکیم، س.پ، ل١٥٩.

وەك ئەم (١٥٧) خێزانەی کە لیژنەی کاروباری باکوور لە نووسراوی نهـێنی ژمـــارە (١٥٤٩/٢٠)و بـــەرواری (١٩٩٧/٩/١١) بڕیـــاری ڕاگواســـتنی دان[٢٤]. بێگومان مەبەست لە (ئاماژەی ئاسایش) ئەوەبوو کە بنەماڵەکـە یـان ئەندامێکی هەستی کوردایەتییان هەیە یان یـەکێکیان ڕایکـردووە بـۆ دەرەوەی عیراق یان لە ناوچە کوردییە ئازادکراوەکانە. چونکە لە بەڵگەنامەیەکی تـردا داوای ڕاگواستنی هەندێ خێزانی کورد کراوە لە شاری خانەقین لەبەر ئەوەی ڕۆڵەکانیان چـوونەتە ڕیـزی خـەباتی ڕزگـاریخوازی کـورد کـە ئـەوان پێیـان دەگوتن (المخـربين) وەك لــە بەڵگەنامەکـەدا هـاتووە[٢٥]. لــە کـەرکووکیش هەنگاوی لەم جۆرەیان ناوەو تەنانەت دەستیان بەسەر موڵك و خـانووی ئـەو ماڵانەشدا گرتووە و بەسەر عەرەبە هاوردەکان دابەشیان کـردووە[٢٦]. بـەڵام هەندێ جاریش ناوچەیەك پڕۆژەیەکی گرنگی تێـدا دامـەزراوە و بـە بیـانووی زامنکردنی ئاسایشی ئەم پڕۆژە خێزانە کوردەکانی ئەم ناوچـەیان ڕاگواسـتووە بـۆ دەرەوەی پارێزگـای کـەرکووك، لــە کاتێکـدا دانیــشتووانە عــەرەب و تورکمانـــەکانیان لـــە ناوچـــەکانی دەوروبـــەری پڕۆژەکـــە ســـەرلەنوێ دامەزراندۆتەوە. وەك ئەم بـارەی کـە لــە بەڵگەنامەیـەکی سـاڵی (١٩٩٨)ی حیزبی بەعسدا باس کراوە[٢٧]. لە پاڵ ئەمانـە بیانوویـەکی کـۆنیش هەمیـشە

---

[٢٤] Ethnic Cleansing…, p.226.

[٢٥] بڕوانە نووسراوی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی دیالە بۆ لێژنەی باکوور لە ساڵی ١٩٩٤، لە: Ibid, p.190.

[٢٦] بۆ نموونە بڕوانە هەردوو بەڵگەنامەی ژمارە (٧٢)و (٧٧) لە: Ibid, p.95,105.

[٢٧] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: Ibid, p. 112.

**لەئارادا بوو، ئەویش بریتی بوو لە ڕاگواستنی ئەو خێزانە کوردانەی کە تۆماری (نفوس)یان لە دەرەوەی پارێزگای کەرکوکە. ئەوەتا لە بەرواری ١٩٩٧/٩/١١دا (٣٧) خێزان بەم بیانووە بڕیاری ڕاگواستنیان لە کەرکووك دراوە[٢٨].**

**تەنانەت لە کاتی دابەشکردنی زەوی بەسەر سەرباز و هێزەکانی ئاسایشدا حکومەت ئەم سیاسەتەی لەبیر نەدەکرد، ئەوەتا لە ساڵی ٢٠٠١ پارێزگاری کەرکووك لە نووسراوێکیدا بۆ شارەوانی بە پشت بەستن بە نووسراوی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار داوا دەکات بۆ سەرباز و ئاسایشە عەرەبەکان زەوی لە کەرکووك تەرخان بکرێت و ناعەرەبەکانیش لە دەرەوەی کەرکووك زەوییان پێ بدرێت[٢٩].**

**ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە ئەوەیە کە دەسەڵاتدارانی بەعس لە چوارچێوەی ڕاگواستنی کورد لە پارێزگای کەرکوکدا تەنانەت دەستیان لەو کوردانەش نەدەپاراست کە یارمەتیدەر و چاوساغی دەزگا سیخوڕییەکانی بەعس بوون، وەك بەڵگەنامەیەکی ساڵی (١٩٩٦)ی پارێزگای کەرکووك بە ئاشکرا ئەمە دەردەخات[٣٠]. کەواتە زۆر ئاساییی بوو ئەگەر ڕاگواستن ئەو کوردانەش بگرێتەوە کە چەکی حکومەتیان هەڵگرتبوو بۆ دژایەتیکردنی**

---

[٢٨] بڕوانە دەقی نووسراوی لێژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکووك بە ژمارە (١٥٤٩/٢٠) لە: Ibid, p. 226.

[٢٩] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەی ژمارە (٩٣) لە: Ibid, p: 170.

[٣٠] نووسراوی پارێزگاری کەرکووك بە ژمارە (٣٨٣)و بەرواری (١٩٩٦/٦/٢٠) بۆ وەزارەتی ناوەخۆ لە: Ibid, p.201

شۆڕشی کورد – مەبەست جاشەکانە – بێجگە لە سەرۆکەکانیان کە پێیان دەگوترا (مستشار) [٣١].

لەبەر ئەوەی ڕژێمی بەعس ئەزموونێکی دوور و درێژی هەبوو لە کرداری ڕاگواستنی کورد دا بۆیە مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کە لەم بوارەدا بەرنامە و پلانی داڕێژراوی هەبێت، ئەوەتا لە نێو بەڵگەنامەکانی بەعسدا چەندین جار ئاماژە بە زاراوەی (پلانی ڕاگواستن= خطة الترحيل) کراوە[٣٢]. هەروەها باس لە جێبەجێ کردنی پرۆسەی ڕاگواستن بە پێی قۆناغی جیاجیا کراوە و هەر قۆناغێکیش ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ دانراوە، وە بۆ بەدواداچوونی ئەم کردارەش دەسەڵاتداران داوای ڕاپۆرتی ناوبەناویان دەکرد بە تایبەتی بە شێوەی هەفتانە[٣٣]. دیارە لیژنەیەکیش لە کەرکووك پێکهێنراوە بە ناوی (لجنة الترحيل = لیژنەی ڕاگواستن) کە ئەرکەکانی لە ناوەکەی ڕا دیارە[٣٤].

سەبارەت بە پلانی ڕاگواستن تێبینی ئەوە دەکرێ کە لە نووسراوێکی ئەیلوولی ١٩٩٧دا سەرۆکی لیژنەی کاروباری باکوور (تەها یاسین ڕەمەزان) داوا لە پارێزگاری کەرکووك دەکات کە پلانێك دابنێن بۆ ڕاگواستنی (١٥٧) خێزانی کورد لە ماوەی سێ مانگدا و بە شێوەیەکی

---

[٣١] نووسراوی لیژنەی باکوور بۆ پارێزگای کەرکووك بە ژمارە (١٩٧٠/١٠)لە (١٩٩٨/٩/١٣) لە:.Ibid, p.250

[٣٢] بۆ نموونە بڕوانە نووسراوەکەی پێشتری لیژنەی باکوور لە: .Ibid, p.226

[٣٣] بۆ سەیرکردنی هەندێ لەم ڕاپۆرتانە بڕوانە: .Ibid, p.191, 194, 200

[٣٤] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٩٧) لە: . Ibid, p.193

(هێمنانـه) [٣٥]. لەمـەوە دەردەکـەوێ کـە بەرپرسـە باڵاکـانی بـەعس هێڵـە گـشتییەکانی پلانـەکانیان دانـاوەو بەرپرسـانی ژێـرەوەش لەسـەریان بـوو وردەکارییەکانی تەواو بکەن. ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەکی تـردا کـە دوو مـانگ دواتر نووسراوە باس لە هەبوونی پلانێك دەکرێ کـە لـە لایـەن بەڕێوەبـەری پۆلیسی پارێزگای کەرکووك داندراوە بۆ پیادەکردنی کرداری ڕاگواسـتن بـە شێوەی (**١٥**) ماڵ لە هـەر حەفتەیەکـدا. ئەمـەش لەبـەر ئـەوە بـوو نـەوەکو ڕاگواستنی کوردەکان بە شێوەیەکی فراوان کێشەیان بـۆ دروسـت بکـات بـە تایبـەتی ئەگـەر بـۆ ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی بێـت، وەك لـە هـەمان بەڵگەنامـەدا هاتووە[٣٦]. دیارە مەبەستیان لەم کێشانە ئـەو فـشارە نێودەوڵەتییـە بـوو کـە لەوانەبوو دروست بێت ئەگەر سیاسەتەکەیان بە زەقـی و بـە شـێوەی بەرچـاو پیادە بکەن.

سەرەڕای ئەم پلانە داڕێژراوانەش کرداری ڕاگواسـتن هـەموو کـات وەك ئەوەی دەسەڵاتداران دەیانویست بـەڕێوە نەدەچـوو، بـە تایبـەتی کـە هەنـدێ خێزانی کورد لە ترسی ئەم سیاسـەتە شـوێنی دانیـشتنی خۆیـان دەگـۆڕی بـۆ ئەوەی پۆلیس و دەزگا سەرکوتکەرەکانی تر نەیاندۆزنەوە. لـە نووسـراوێکی ئەیلوولی **١٩٩٧**دا سەرۆکی لێژنەی باکوور داوا لە پارێزگـاری کـەرکووك دەکات بە دوای ئەو (**١٤٥٥**) خێزانە کوردە بگەڕێن کە جێگەیان دیار نییـە، وە لە کاتی گرتن یان دۆزینەوەیان دەبێ دەسـتبەجێ دەربکـرێن و پـسوولەی

[٣٥] بڕوانە نووسراوی لێژنەی ناوبراو بە ژمارە (١٥٤٩/٢٠) لە: Ibid, p. 226.
[٣٦] نووسراوی جێگری پارێزگار بۆ خودی پارێزگار لە (١٩٩٧/١١/١٦) لە:
Ibid, p.239.

ئازووقەیان لیّ بسێنرێتەوە[٣٧]. جێگەی ئاماژە پێدانــە کێــشانەوەی پــسوولــەی ئازووقە لـە لایەن دەســەڵاتدارانەوە وەك فـشارێك بـەکاردەهێنرا بـۆ ملکـەچ کردنی خێزانە کوردەکان بۆ بڕیاری ڕاگواستنیان.

هەروەها جاری وا هەبوو هەندێ خێزان دوای ڕاگواستنیان دەگەڕانەوە کـەرکووك و خۆیـان لــە هەنـدێ شـوێنی نادیـاردا حەشـاردەدا وەك ئـەوەی خانووێکیان بەکرێ دەگرت یان لە ماڵی کەسێکی نزیکیان یان لــە کارگـە و کۆگاکان دەحەوانــەوە. بـەڵام دەسـەڵاتدارانی بـەعس بـۆ ڕێگـە گـرتن لــەم دیاردەیە ئەو کەسانەیان بە بەندکردن سـزا دەدا کـە ئـەم ڕاگوێزراوانـە (یـان ئەوانەی کە دەیانــەوێ ڕایـانبگوێزن دەحەوێننــەوە)[٣٨]. هـەروەها ئـەو ماڵــە ڕاگوێزراوانەشیان بۆ ماوەی مانگێك بەند دەکرد[٣٩].

ئەم خێزانە کوردە ڕاگوێزراوانە لە لایـەن دەسـەڵاتدارانەوە دوو ڕێگــەیان لەبــەردەم دادەنــرا، ئــەوانیش بــریتی بــوون لــە کۆچــکردن بــەرەو ناوچــە ئازادکراوەکانی کوردستان– کـە لــە بەڵگەنامــەکان پێــی دەگــوترا ناوچــەی ئۆتۆنۆمی– یان دەبوو پارێزگاکانی ناوەڕاست و باشـووری عـیراق هەڵبــژێرن جگە لە هەردوو پارێزگای موسڵ و دیالە[٤٠]. بەڵام دیارە زۆربەی یان هەموو ڕاگوێزراوەکان بەرەو ناوچە کوردییەکان کۆچیان کردووە وەك نووسراوێکی

---

[٣٧] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.226.

[٣٨] بۆ نموونە بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٠٧) لە: Ibid, p.215-217, 220-223.

[٣٩] بۆ نموونە بڕوانە نووسراوی پارێزگاری کەرکووك بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بە ژمارە (١٢٧١)و بەرواری (١٩٩٨/١١/٢٥) لــە: Ibid, p.258.

[٤٠] بڕوانە نووسراوی ژمارە (١٥٤٩/٢٠)و بەرواری (١٩٩٧/٩/١١)ی لێژنەی باکوور لە: Ibid, p.226.

پارێزگـای کـەرکووك بـە ژمـارە (١١٣٣) بـەرواری (١٩٩٨/١٠/١٨) ڕایدەگەیـەنێ، وە ئەمـەش جێگـەی دڵخۆشـی دەسـەڵاتداران نـەبوو چـونکە دەیـانزانی ئـەم ڕاگوێزراوانـە دەبنـە هێـزی زیـادە بـۆ حکومـەتی هـەرێمی کوردستان، هەروەها بـەم شـێوەیە خـاکی کـورد بـە عـەرەب دەکـەن بـەڵام کوردەکان بـە عـەرەب نـابن. بۆیـە پارێزگـاری نـاوبراو لـە نووسـراوەکەی پێشوویدا داوا لە بەڕێوەبەری پۆلیس دەکات کە ڕاگوێزراوەکان هان بدەن بۆ ئەوەی پارێزگاکانی ناوەڕاست و باشووری عیراق هەڵبژێرن وە لـەم بارەشـدا لە چەند خاڵێکدا سوودمەند دەبن کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١- بردنی هەموو ماڵ و موڵکی لەگەڵ خۆی.

٢- وەرگرتنی پارچەیەك زەوی لەو پارێزگایەی کە بۆی دەگوێزرێتەوە.

٣- وەرگرتنی بڕی (٥٠ هەزار دینار).

٤- وەرگرتنی قەرزی بانقی خانووبەرە بۆ ئەوانەی فەرمانبەرن.

لەگەڵ چەندین ئاسانکاری تر[٤١].

سەبارەت بە ماڵ و موڵکی کوردە ڕاگوێزراوەکان تێبینی ئەوە دەکـەین کە حکومەتی بەعس بەرە بەرە پێدرێـژی کـردووە و لـەم لایەنـەدا هـەنگاوی دڕندانەتری هـەڵێناوە. دیـارە سـەرەتا مـاوەی سـێ مـانگ مۆڵـەت بـە هـەر ڕاگوێزراوێك دەدرا بۆ ئەوەی موڵکە نەگوازراوەکانی بفرۆشێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کرداری فرۆشتنەکە بەو خێراییە نەدەبوو کە دەسەڵاتداران دەیانویست بۆیە (تەها یاسین ڕەمەزان)ی سەرۆکی لیژنەی باکوور لە نووسـراوێکی نهـێنی بـە ژمـارە (١٧/٣٣)و بـەرواری (١٩٩٦/١/٤)دا ڕەزامەنـدی دەردەبـڕێ

---

[٤١] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.256.

لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەك لە هەریەکە لە پارێزگاکانی کەرکووك و موسڵ و دیالــە بــۆ فرۆشــتنی موڵکــە نێوبراوەکــان و بەخــشینی نرخــەکانی بــە خاوەنەکانیان(٤٢). بێگومان لێرەدا خاوەنەکان زیانیـان پـێ دەکـەوت چـونکە کارێکی ئاسایی بوو کە لیژنەکە بە هـەر نرخـێ بـێ دەیویـست ئـەم موڵکانـە بفرۆشێت.

سەرەڕای ئەمەش هێشتا ئەم مەسەلەیە چارەسەر نەبوو چونکە کڕیار بـۆ ئەم هەموو خانووبەرەیە پەیدا نەدەبوو، بە تایبەتی کە ئەوانیش تەنیا بە ڕەگـەزی عەرەبیان دەفرۆشـت – بـەو پێیـەی کوردەکـان نەیانـدەتوانی خانووبـەرە لـە کەرکووك بکڕن وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد–، ئەوەتا پارێزگاری کەرکووك لە نووسراوێکیدا بە ژمارە (٥٠٤)و بەرواری (١٩٩٦/٨/١٣) بـۆ وەزیـری ناوەخۆ ڕوون دەکاتـەوە کـە دوای ڕاگەیانـدن بـۆ فرۆشـتنی (٥٥) خـانووی خێزانە ڕاگوێزراوەکان تەنیا سێ کڕیار لە مەزادەکە ئامادە بوون. لەبەر ئەوەی ئەم خانووانە دەکەونە ناوچە کوردییەکان و تـەنیا عـەرەبیش مـافی هاتنـە نـاو مەزادیان هەیە. بۆیە ناوبراو پێشنیار دەکا پارێزگا ئـەم خانووانـە بـە نرخێکـی خەملێنراو بکڕێتەوە بۆ ئەوەی دواتر بە خۆڕایی بەسـەر عەرەبـە هاتووەکانـدا دابەشی بکـات(٤٣). ئەگـەر هەڵوەسـتەیەك لەسـەر ئـەم هۆکـارە بکـەین کـە پارێزگاری ناوبراو باسی دەکـات، بۆمـان بـەدیار دەکـەوێ کـە عەرەبـەکانی کەرکووك (بە هاوردەکانیشیانەوە) یـان هـەموویان خـانووی تایبـەتی خۆیـان هەبوو وە پێویستییان بەم خانووانە نەبوو، وە یـان نەیاندەویـست لـە گەڕەکـە

---

(٤٢) بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:. Ibid, p.196

(٤٣) Ibid, p.204.

**کوردنشینەکان نیشتەجێ بن یاخود موڵکیان هەبێ، دیارە هەستیان بەدڵنیایی نەدەکرد چونکە دەیانزانی ئەوان نامۆن لە کەرکووك و ناتوانن تا سەر لەم شارەدا بمێننەوە. لە ڕاستیدا ئەم پێشنیارە پەسند کراو لە بەڵگەنامەکانی تردا دەبینین کە ماڵە کوردەکان لە خانووەکانیان دەردەکرێن و لە بەرامبەر خانووەکەیان نرخێکی ڕەمزییان لە پارێزگا بۆ تەرخان دەکرێت بۆ ئەوەی ئەم کردارە بچێتە چوارچێوەی فرۆشتنی شەرعییەوە. ئنجا عەرەبە هاوردەکان دێنە سەر ئەم خانووە ئامادە و چۆلکراوانە[٤٤]، کە بە ڕواڵەت کراون بەڵام هەر حکومەت خۆی لە بەڵگەنامەکانیدا بە (دور مصادرة= خانووی دەست بەسەرداگیراو) ناوی دەبردن[٤٥].**

**بەر لەوەی کۆتایی بە باسی مەسەلەی ڕاگواستن بێنین دەبێ ئاماژە بە نووسراوێکی دەستنووسی جێگری پارێزگاری کەرکووك بکەین کە لە بەرواری ١٩٩٧/١١/١٦دا بۆ پارێزگاری ئامادە کردووە، لەم نووسراوەدا هەندێ ئاماری ورد لەسەر ڕاگواستنی کورد خراوەتە ڕوو، کە ئاماژە بەوە دەکەن دەسەڵاتدارانی بەعس لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٩١ تا ١٩٩٥ تەنیا (٣٥٧) خێزانیان ڕاگواستووە، بەڵام لە هەر سێ ساڵی ٩٥-٩٦-٩٧ ئەم ژمارەیە بەرز بۆتەوە بۆ (١٨٢٠) خێزان و بڕیاریش بوو ڕاگواستن (١٨٤٣) خێزانی تر بگرێتەوە[٤٦]. ئەگەر لەم ئامارانە ورد بینەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ژمارەی ڕاگوازراوان لە ماوەی یەکەمدا لەبەر ئەوە کەمترە لە چاو ساڵانی**

---

[٤٤] بڕوانە چەند بەڵگەنامەیەك لەم بارەیەوە لە: Ibid, p, p.224,231,233.

[٤٥] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١١٣) لە: Ibid, p. 240 .

[٤٦] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.239.

دواتر چونکه حکومـەتی بـەعس لـە دوای ڕاپـەڕین بـۆ ماوەیـەك پەنـدی لـە ئەزموونی ڕاپەڕین وەرگرت و نەیدەویست دڕندایەتییەکەی بە شێوەی پێـشوو زۆر زەق و بەرچاو بێت.

## ٢- هاوردن و جێنشینکردنی عەرەب:

لە ساڵانی بەر لـە ڕاپەڕین ژمارەیەکی زۆری عەرەبی هاوردە لە کـەرکووك و ناوچەکانی دەوروبەری نیشتەجێ کرابوون بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لـە بـاری ئێتنـۆگرافی دەڤەرەکـەدا بکـەن[٤٧]. وە بـۆ مانـەوەی ئـەم هاوردانـە چـەندین هـەنگاویان هـەڵێنابوو وە جۆرەهـا ئاسـانکارییان پێـشکەش کردبـوون، وەك تـــەرخانکردنی زەوی کـــشتوکاڵی بـــۆ جووتیارەکانیـــان و گواســـتنەوەی سەربازەکانیان بـۆ یەکـە سـەربازییەکانی نزیـك شـوێنی نیـشتەجێ بوونیـان و چەندین کاری تری لەم جۆرە[٤٨].

سەرەڕای هەموو ئەمانەش عەرەبە هاوردەکان لە ئەنجامی ڕاپـەڕینی ئـاداری ١٩٩١ و ڕزگارکردنی کەرکووك لە لایەن کوردەوە مەترسییان لێ نیشت و بۆیان ڕوون بۆوە کە ئەوان نـاتوانن هـەتا سـەر مـاف و مـوڵکی کوردەکـان زەوت بکەن. بۆیە دەبینین ژمارەیەکی زۆری ئەم عەرەبانە داوای گەڕانەوە بـۆ شوێنەکانی خۆیان پێشکەش بە حکومەت دەکەن کاتێ گوێ بیست دەبن کـە

---

[٤٧] لەم بارەیەوە بڕوانە: د. گوینتەر دێشنەر، کورد: گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێ کراو، گۆڕینی بۆ کوردی: حەمەکەریم عارف، چ٢، هەولێر: ١٩٩٩، ل٢٢٩-٢٣٠.

[٤٨] دەقی بەڵگەنامەی لێژنەی باکوری سەر بەئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە: Ethnic Cleansing…,p.36-37

ڕێگەیان پێـدراوە بگەڕێنـەوە، ئـەم زانیارییـە لـە نووسـراوێکی نهـێنی ژمـارە (١٧٤٤/٣٨)و بـەرواری (١٩٩٣/٣/٢١)ی لقـی کـەرکووکی حیزبـی بەعسدا هاتووە و تیایدا ئەمینداری لق داوا دەکات فشاری ماددی بخرێتە سەر ئەم عەرەبانە بۆ ئەوەی ئەوانیتر چاویان لێ نەکەن و ئەوانەش پاداشـت بکـرێن کە بڕیاریان داوە لە شوێنی خۆیان بمێننەوە[٤٩].

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا دیاردەیەکی تریش لە ئارادابوو وەك لە ڕاپۆرتێکی فەرمی ساڵی ١٩٩٦دا هاتووە، ئـەویش ئـەوەبوو کـە لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٩١دا ژمارەیـەکی زۆری کـوردی دانیـشتووی ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی (ئازادکراو) بەرەو کەرکووك ڕەویان کردو لە نێویاندا هەندێ خێزان هەبوون کە بەر لە ساڵی ١٩٩٠ لـە کـەرکووك ڕاگوێزرابـوون، دیـارە ئـەم تەوژمـە بەرادەیەك بەرچـاو بـووە کـە ڕێـژەی دانیـشتووانی کـورد لـە کەرکووکـدا گەیشتۆتە نزیکەی ٦٠٪، وە تەنانەت هەندێ گەڕەکی تەواو عەرەبی بوونەتـە کوردنشین وەك گەڕەکەکانی (الکرامە) و (ئیسکان) و (شورتە) و (شۆڕیجە). ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی دانیـشتووانە عەرەبـەکانیان دوای ڕاپـەڕین بـەجێیان هێشتوون، وەك لە ڕاپۆرتە ناوبراوەکە دەردەکەوێ[٥٠].

لە ئەنجامی ئەم بارودۆخ و هەڵوێستە –کە بێگومان بە دڵی ڕژێمی بـەعس نەبوو لە بەڵگەنامەکاندا تێبینی ئەوە دەکرێ کە لەو ماوەیـەدا ڕژێمـی نـاوبراو بە شـێوەیەکی دڕندانـەتر و بەرنامـە ڕێـژتر وە لـە هـەمان کاتیـشدا فـراوانتر ڕەگەزی عەرەبی لە دەڤەری کەرکووك نیشتەجێ کـردووە. تەنانـەت لاسـایی

---

[٤٩] Ibid, p.47.

[٥٠] بڕوانە دەقی ڕاپۆرتەکە لە: Ibid, p.82.

هەردوو دەوڵەتی ئیسرائیل و سوریایان کردۆتەوە لە دامەزرانـدنی نـشینگە و کۆمەڵگەی نیشتەجێی عەرەبی لە ناوچە کوردنشینەکان بۆ ئەوەی پشتێنەیەکی ئاسـایش (الحـزام الامـني) لــە دەوری کـەرکووك دروسـت بکـەن وەك لــە بەڵگەنامەیەکی ساڵی (٢٠٠٠)دا بەرپرسـانی بـەعس خۆیـان ئاماژەیـان بەمـە کردووە[٥١]. ئەوەتا لە نووسراوێکی پارێزگاری کەرکووك بە ژمارە (٤٨٢)و بــەرواری (١٩٩٥/١٠/١٨)دا بـــاس لــــە دروســـتکردنی گونـــدێك و کۆمەڵگەیەکی نیشتەجێبوون کراوە بۆ هۆزە عەرەبەکان لە شارۆچکەی پردێ و ناحیەی (القدس= سەرگەڕان)ی هەڵوەشاوە، هەروەها گوندێك لە ڕێگـای کەرکووك – لەیلان و پێنج کۆمەڵگەش لە ناوچەی دارەمان لــە گونـدەکانی (کلـورە، نـەبیاوە، گـەلۆزی، بیبـانی گـچکە، یارمجـە) بـۆ هـەمان مەبەسـت دامەزراوە[٥٢]. شایانی باسـە زۆر جـار حکومـەت بـۆ جێبـەجێ کردنـی ئـەم سیاسەتە دەستی دەگرت بەسەر موڵــك و زەویـوزاری کـوردان لــە بەرامبـەر نرخێك کە خۆی دیـاری دەکـرد[٥٣]. بـۆ نموونـە لــە نووسـراوێکی لیژنـەی بـاکوور بـۆ پارێزگـاری کـەرکووك بـە ژمـارە (١٥٣٦/٢٠)و بـەرواری (١٩٩٧/٩/١٠) ڕەزامەندی پیشاندراوە لەسەر دامەزراندنی سێ کۆمەڵگەی نیشتەجێبوون بۆ هۆزە عەرەبەکان، یەکێکیان لە کەرتی (طـوراغ)و دووەمیـان

---

[٥١] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: د. خلیل اسماعیل، مؤشرات...، ص٢٨.

[٥٢] Ethnic Cleansing..., p.69.

[٥٣] بڕوانە دەقی ڕاپۆرتێکی فەرمی لەم بارەیەوە لە: (Ibid, p.90.)شایانی باسە زۆربەی جوتیار و خاوەن زەوییە کوردەکان ئەم پارەیان وەرنەدەگرت و بۆ فرۆشتنی زەویەکانیان مۆریان نەدەکرد.

لــە مەڵبەنــدی ناحیــەی (شــوان)ی هەڵوەشــاوەو ســێیەمیش لــە ناحیــەی (قەرەهەنجیر= الربیع)ی هەڵوەشاوە. هەروەها بڕیار دراوە لەم ناوچـانەی کـە هۆزە عەرەبەکانی تێدا نیشتەجێ دەکرێن (٢٠٠) دۆنم بدرێتە هەر جووتیارێك و (٣٠٠) دۆنمیش بۆ سەرۆك هۆزەکە[٥٤]. لە نووسراوێکی تری هـەمان ئـەو ماوەیەدا کە تایبەتە بە تەرخانکردنی زەوی ناوچە کوردییەکان بۆ هۆزە عەرەبە هاوردەکان، بۆ دەسەڵاتداران ڕوون کراوەتەوە کە:

– هیچ ڕووبەرێکی بەتاڵ و تەریك نەماوە لە تەوەری شوان کە بەسـەر هـۆزە عەرەبەکان دابەش نەکرابێ.

– هیچ زەویوزارێکی کشتوکاڵی چۆڵ و بەتاڵ نـەماوە لــە تـەوەری شـوان و ئاڵتون کۆپری کە بەسەر هۆزە عەرەبەکان دابەش نەکرابێ.

– هیچ زەوییێکی موڵکی تایبەت نییە لە تەوەری شوان – ئاڵتون کـۆپری کـە دابەش نەکرابێتە سەر هۆزە عەرەبەکان[٥٥].

کاتێ دەسەڵاتدارانی بەعس بەم شێوەیە هەندێ هۆزی عەرەبیان وەك داشی دامە بۆ سیاسەتی بەعەرەبکردن بەکارهێناوە و لەم پێنـاوەدا سـوود و قـازانجی زۆریان پێداون. ئەمە وای لە هەندێ هۆزی عەرەبی تـریش کـردووە کـە داوا بکەن شوێنی نیشتەجێ و زەویوزاریان لەسەر حیسابی کوردان بۆ دابین بکرێ، وەك هۆزی (الجمیلة) [٥٦].

(٥٤) Ibid, p.104.

(٥٥) بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.90-91.

(٥٦) بڕوانە دەقی داواکاری سەرۆکی ئەم هۆزە لە: Ibid, p.140.

بێگومان هاوکات لەگەڵ ئەمانەدا لە ناو شاری کەرکووکیش پرۆسەی هێنان و نیشتەجێکردنی ڕەگەزی عەرەب لە ئارادا بوو. لە نووسراوێکی حیزبی بەعسدا کە لە شوباتی ١٩٩٤ دەرچووە ئاماژە بەوە کراوە کە زەوی نیشتەجێبوون بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام و کادیرە عەرەبەکانی حیزب تەرخان کراوە[٥٧]. وە لە نووسراوێکی پارێزگای کەرکووك بۆ لێژنەی باکوور لە بەرواری (١٩٩٧/١٢/١٥)دا چەند پێشنیارێك خراونەتە ڕوو لە پێناو ڕاکێشانی ژمارەیەکی زۆری عەرەب بۆ دانیشتن لە شاری کەرکووك و بەرزکردنەوەی ڕێژەی ئەم ڕەگەزە تیایدا. کە ئەمانە بوون:

١- تەرخانکردنی داهاتی گومرگی سلێمانی بۆ بنیادنانی خانووی کەم تێچوو لە شارەکەدا.

٢- دروستکردنی خانووەکانی نیشتەجێبوون لە نزیك ئەو گەڕەکانەی کە ڕێژەیەکی گەورەی کەمایەتییەکانی تری تێدایە (مەبەست کورد و تورکمانە).

٣- دابەشکردنی ئەم خانووانە بەسەر عەرەبە هاوردەکان.

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هەمان ئەو نووسراوە ئاماژە بەوە دەکات کە بە پێی ئاماری ساڵی ١٩٩٧ لە پارێزگای ناوبراودا ڕێژەی عەرەب (٧٣٪)و لە خودی شاری کەرکووکیش (٥٨٪) بوو[٥٨]. بێگومان بەرزبوونەوەی ڕێژەی عەرەب بەم شێوەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر خێرایی و کاریگەری سیاسەتی بەعەرەبکردن لەم ماوەیەدا.

---

[٥٧] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.64.

[٥٨] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.107-108.

لێرەدا ئەوە ماوە بڵـێین کـە دەسـەڵاتدارانی بـەعس لـە سیاسـەتی هێنـان و نیشتەجێکردنی عەرەبەکان لە کەرکوك هەندێ بنەماو ڕێ و شـوێنیان دانـابوو کـە پەیڕەویان دەکرد: لە پێش هەموو شتێکدا ئەوان مەبەسـتیان بـوو ڕەگـەزی عـەرەب بهێننە کەرکوك ئەگەر عیراقیش نەبێ، بۆیە دەبینین هەندێ عـەرەبی میسریـشیان لـە کەرکوك نیشتەجێ کردووە و بۆ ئـەم مەبەسـتە زەوییـان پێـداون[٥٩]. ئنجـا زیـاتر ئاراستەکە بەرەو ئـەوەبوو کـە عـەرەبی دەرەوەی پارێزگـای کـەرکوك بهێننـە ئـەم پارێزگایە[٦٠]، بێگومان بۆ ئەوەی کار لە ڕێژەی دانیشتووان بکەن. وە بۆ ئەوەی ئـەم عەرەبە هاوردانە بە تەواوی پەیوەندییان بە شوێنی ڕەسەنی خۆیان بپچڕێ مەرجیان بـۆ دادەنان کە دەبێ تۆماری نفـوس و هـەروەها پـسوولـەی ئازووقـەیان بگوازنـەوە بـۆ شـوێنی جێنـشینکردنی تازەیـان. وە لـە چـەندین بەڵگەنامـەدا ئەمـە دووپـات کراوەتەوە[٦١]. تەنانەت لە هەندێ باردا فشاری توندیان دەخستە سەر ئەوانـەی کـە ئەم کارەیان ئەنجام نەداوە، ئەوەتا لە ساڵی **١٩٩٧**دا بەروبوومی دانەوێڵـەی چـەند جووتیارێکی عەرەبی هاوردەیان بە شێوەیەکی کاتی دەست بەسـەرداگرت تـا تۆمارەکانیان دەگوازنەوە ئەو شوێنەی کە بۆی هاتوون[٦٢].

---

[٥٩] بڕوانـە نووسـراوی لێژنـەی بـاکوور ژمـارە (١٦٨٣/٢٠)و بـەرواری (١٩٩٦/١٢/٢) بـۆ پارێزگـاری کـەرکوك. هـەروەها نووسـراوی پارێزگـاری کـەرکوك بـۆ بەڕێوەبەرایـەتی ڕەگەزنامە و کاروباری شارسـتانی بـە ژمـارە (٥٨٩٢/١٧)و بـەرواری (١٩٩٧/٥/٢٨) لـە: Ibid,p.84,93.

[٦٠] بڕوانە نووسراوێکی لێژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکووك لە: Ibid, p.104.

[٦١] بۆ نموونە بڕوانە بەڵگەنامەکانی ژمارە (٦٣ و ٦٥ و ٨٥) لە: Ibid, p.64, 69, 140.

[٦٢] بـۆ نموونـە بڕوانـە سـکاڵای هاوڵاتییـەکی عـەرەب لـە بـەرواری (١٩٩٧/٨/٢٥) لـە: Ibid, p.101.

وە لە لایەکی تر بۆ ئەوەی هۆزە عەرەبە هاوردەکان بتوانن بەرگری لە مانەوەیان بکەن لەم شوێنانەی پارێزگای کەرکوك کە تیایدا نیشتەجێ کراون، دەسەڵاتداران بڕیاریان دابوو ئەم هۆزانە چەکدار بکرێن وەك لە بەڵگەنامەیەکی ساڵی ١٩٩٦ دەردەکەوێ[٦٣]. لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینیش ئەم هۆزە عەرەبیانەی کە ڕەتیان دەکردەوە چەك هەڵبگرن بەوە تاوانبار دەکران کە لەگەڵ پێشمەرگەکان (المخربین) هاریکارن[٦٤]. بێگومان ئەمەش وەك فشارێك بوو بۆ سەر ئەم هۆزانەی دوایی.

مەسەلەیەکی بەڵگە نەویستیشە کە ڕژێم چەندین ئاسانکاری ئەنجام دەدا بۆ نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبەکان لەو ناوچانەی کە دەیەوێ، بە تایبەتی لێدانی بیری ئاو و ڕاکێشانی تەزووی کارەبا و هی تر[٦٥].

لە کۆتاییدا خاڵێك هەیە کە جێگەی سەرنجە ئەویش ئەوەیە کە بەشێکی کەمی ئەم عەرەبە هاوردانە ڕۆشنبیر و خاوەن بڕوانامەی خوێندن بوون، ئەوەتا سەرەڕای ئەم هەموو لێشاوەی هێنانی ڕەگەزی عەرەب بۆ کەرکوك کەچی لە ساڵی ١٩٩٧دا لە هەموو شارەوانییەکانی کەرکوك تەنیا ئەندازیارێکی عەرەب نەبوو، وەك بەڕێوەبەری شارەوانییەکان خۆی وا دەڵێ[٦٦]. هەروەها بەرپرسانی پەروەردەش هەندێ جار سکاڵایان پێشکەش کردووە لەبەر کەمی مامۆستا[٦٧].

---

[٦٣] بڕوانە نووسراوی لێژنەی باکوور بۆ بەرپرسێکی بەعس لە: Ibid, p.80.

[٦٤] بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (٣) لە: د. خلیل اسماعیل، مؤشرات...، ص٦٧.

[٦٥] بڕوانە هەردوو نووسراوی لێژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکوك بە ژمارەکانی (٥٧٣/٢٠)و (١٥٣٦/٢٠) لە بەرواری (١٩٩٥/٥/٦)و (١٩٩٧/٩/١٠) لە: Ethnic Cleansing..., p.67, 104.

[٦٦] نووسراوی ژمارە (٧٠) بەرواری (١٩٩٧/١١/٢) بۆ پارێزگاری کەرکوك لە: Ibid, p.234.

[٦٧] بڕوانە نووسراوێکی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی بەعس بۆ لێژنەی باکوور لە: Ibid, p.61.

### ٣- گۆڕینی ناسنامەی نەتەوەیی:

لە پێناو سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتی کوردی لە دەڤەری کەرکووك و بە ئاکام گەیشتنی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی لەم دەڤەرەدا، دەسەلاّتدارانی بەعس هەولّیان دا بە تەواوی سیماو ڕوخساری بگۆڕن و کالاّی عەرەبی بە بالاّی کەرکووکدا بکەن. لەم بوارەدا هەولّەکانیان دوولایەنە بوو:

لایەنی یەکەم جوگرافیا و شوێن و دیاردەکانی شارستانی گرتەوە، بێگومان لە سالاّنی بەر لە ڕاپەڕینیش ئەم مەسەلەیان بە بیردا هاتبوو وە هەلّمەتێکی فراوانی بەعەرەبکردنی ناوی گەڕەك و ناوچە و مزگەوت و قوتابخانە و کتێبخانەکانیان پیادە کردبوو[٦٨]. کە دیارترین کاریان لەم بوارەدا گۆڕینی ناوی پارێزگاکە بوو لە (کەرکووك)ـەوە بۆ (التأمیم) بە پێی مەرسومی کۆماری ژمارە (٤١)و بەرواری (١٩٧٦/١/٢٩) [٦٩]. تەنانەت دارخورمایەکی زۆریان لەسەر شەقامە گشتییەکانی کەرکووکدا چاند هەر بۆ ئەوەی ڕووکارێکی عەرەبانە بدەن بە شارەکە[٧٠].

لە دوای ڕاپەڕینیش ئەم هەولاّنە هەر بەردەوام بوون، بۆ نموونە بە پێی فەرمانێکی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار لە (١٩٩٨/١٢/٢٤)دا ناوی ناحیەی قەرەحەسەن گۆڕا بۆ (أم المعارك) [٧١]. جێگەی پێکەنینە کە حکومەتی بەعس

---

[٦٨] لەم بارەیەوە بڕوانە: عبدالرحمن صدیق، کرکوك/ مأسأة مدینة، ط١، اربیل: ٢٠٠٣، ص٢٩، هەروەها: عەبدال نوری عەبدال، س.پ، ل٣٩.

[٦٩] د. خلیل اسماعیل محمد، کرکوك/ دراسات في التکوین القومي للسکان، اربیل: ٢٠٠٢، ص١١٧.

[٧٠] د. ڕەفیق شوانی، کێشەی کەرکووك و چۆنیەتی چارەسەرکردنی، هەولێر: ٢٠٠٧، ل٣٤.

[٧١] Ethnic Cleansing…, p.25.

لە هەزارەی سێیەمیش دەستبەرداری ئەم کردارانەی نەبوو، ئەوەتا پارێزگاری کەرکووك لە نووسراوی ژمارە (٥٤٧)و بەرواری (٢٠٠١/٤/١)دا بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەك دەدات بۆ گۆڕینی ناوی گەڕەکەکانی شاری کەرکووك و قەزاو ناحیەو گوندەکانی کە ناوەکانیان کوردییە بۆ ناوی عەرەبی وا کە کرۆکی نەتەوەییان هەبێ[٧٢]. وە لە بەرواری (٢٠٠١/٦/١١)دا داوا لە شارەوانی کەرکووك دەکات کە ناوی ئەو دوکان و شوێنە بازرگانییانە بگۆڕێن کە عەرەبی نین بۆ ناوی عەرەبی وا کە بگونجێ لەگەڵ هەلومەرجی ئەو کاتە[٧٣].

لایەنی دووەمی ئەم سیاسەتە مرۆڤەکانی دەگرتەوە، ئەمەش کاتێك دەسەڵاتدارانی بەعس لە ژێر فشاری ڕاگواستن و دەربەدەرکردن هەندێ لە خێزانە کوردەکانیان ناچار دەکرد کە ڕەگەز و نەتەوەی خۆیان لە کوردییەوە بگۆڕن بۆ عەرەب. ئەم کردارە کە لە ژێر ناوی (تصحیح القومیة= ڕاستکردنەوەی نەتەوە) ئەنجام دەدرا و چەندین خێزانی کورد بە ناچاری پەنایان بۆ دەبرد[٧٤]، لە لایەن حکومەتی بەعسەوە لە پاڵ سیاسەتی ڕاگواستن پەیڕەو دەکرا. چونکە بەم شێوەیە دەیانتوانی لە ڕێگەی گۆڕینی تۆمارە فەرمییەکان باری ئەتنۆگرافی کەرکووك بە لای ڕەگەزی عەرەبدا بشکێننەوە.

---

[٧٢] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە:.Ibid, p.162

[٧٣] بڕوانە دەقی ئەم نووسراوە لە:.Ibid, p.164

[٧٤] بڕوانە نووسراوێکی پارێزگاری کەرکووك بە ژمارە (٦٢٠١/١٧) بەرواری (١٩٩٧/٦/٨) لە: .Ibid, p.95

بـه تایبـەتی کـە هاوکـات لـەگـەڵ ئەمـەدا قەدەغـەیان کردبـوو عەرەبـەکان ڕەچەڵەکی نەتەوەیی خۆیان بگۆڕن بۆ نەتەوەی تر[٧٥].

ئەم کوردانە کە پەنایان بۆ ئەم ڕێگا چارەیە بردبوو لە پێناو ئەوەبوو کە لـە چەوسـانەوە ڕزگاریـان بێـت و هـەمان مـافی دانیـشتووانە عەرەبـەکانی کەرکووکیان هەبێت لە خاوەنداریەتی و نیـشتەجێبوون و کارکردنـدا، بـەڵام هەرگیز بە چاوی یەکسانی سەیر نەکران لـە لایـەن دەسـەڵاتدارانەوە. ئـەوەتا پارێزگاری کەرکووك کاتێك لە ساڵی (١٩٩٧)دا تێبـینی ئـەوە دەکـات کـە ژمارەیەکی زۆری ئەم کوردانە خانووبەرە و زەوی کـشتوکاڵی دەکـرن و بـە ناوی خۆیانەوە تۆماری دەکەن بەو پێیـەی بـە عـەرەب ئـەژمار دەکـرێن، لـە نووسراوێکدا بۆ لیژنەی باکوور پێـشنیاری ئـەوە دەکـات کـە ئەمانـە ئەگـەر تۆمـاری (نفـوس)یـان هـی دەرەوەی پارێزگـای کەرکووکـە ئـەم مافـە نەیانگرێتەوە[٧٦]. وە لە نووسـراوێکی تـردا کـە ژمـارە (٩٤٦) و بـەرواری (١٩٩٨/٩/١)ی هـەڵگرتووە ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە سـەرۆکی لیژنـەی باکوور فەرمانی داوە ئەگەر دانیشتووانی ناوچەی ئۆتۆنـۆمی (ڕاسـتکردنەوەی نەتەوە)شیان کردبێ ئەمە بیانووی نیـشتەجێبوونیان لـە پارێزگـای کـەرکووك ناداتێ و مانەوەیان لەوێ هەر کاتییە و جێگەی خۆشحاڵی ئەوان نییـە[٧٧]. وە لە ساڵی (٢٠٠٠)دا بەرپرسانی باڵای حکومەت بڕیاریان داوە کە ئەم جـۆرە کوردانە تەنیا ئەگەر دانیشتووی شاری کەرکووك بن و لـەئاماری (١٩٥٧)دا

---

[٧٥] بڕوانە دەقی بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ژمارە (٨٥٠) لە: Ibid, p.15.

[٧٦] بڕوانە دەقی نووسراوەکە لە: Ibid, p.95.

[٧٧] Ibid, p.126.

لەویَ ناویان هەبیَ ئنجا دەتوانن مولْكیان لەو شارەدا هەبیّت، بەلاّم ئەگەر تۆمارەكانیان لە قەزاو ناحیەكانی پاریزگای كەركووك بیَ و لەئاماری (**١٩٥٧**)دا ناویان لەویَ هەبیَ ئەوانە مافی مولْكدارییان نابیَ لە شاری كەركووك، بەلْكو تەنیا دەتوانن لەم قەزاو ناحیانە مولْك بكرِن(٧٨). ئەمە لە كاتێكدا بوو كە عەرەبەكان لە هەر ناوچەیەكی عیراقدا هاتبان دەیانتوانی لە هەر جیٚگایەكی پاریزگای كەركووك دانیشن و مولْكیان هەبیَ، وەك پیٚشتر بۆمان روون بۆوە.

## ج- بواری پەروەردە و فیٚركردن:

بیٚگومان پەروەردە و فیٚركردن بواریٚكی زۆر هەستیارە لە هەر كۆمەلْگایەكدا لەبەر ئەوەی بناغەی هۆشیاری و رۆشنبیری كۆمەلْ لەویٚرا دادەمەزریَ و گەشە دەكات، بۆیە رژیٚمی بەعس ئەم لایەنەی زۆر بە لاوە گرنگ بوو لە سیاسەتی پاكتاوی رەگەزیدا كە لە هەمبەر كوردانی كەركووك پەیرەوی دەكرد. وە بە شیٚوەیەكی تایبەتی مەبەستیان بوو بە گیانیٚكی نەتەوە پەرستی عەرەبی و بەعسی قوتابیەكان پەروەردە بكەن و زمان و رۆشنبیری عەرەبی لە نیٚویان بلاّوبكەنەوە، وە بە تەواوی رۆشنبیری كوردی فەرامۆش بكەن، بە تایبەتی كە لە سالاّنیٚكی زووەوە خویٚندن بە كوردی لە پاریزگای كەركووك قەدەغە كرابوو بەو پیٚیەی لەگەلْ پاریزگاكانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەژمار نەدەكرا(٧٩).

---

(٧٨) سەیری دەقی بریارەكە بكە لە: Ibid, p.152.

(٧٩) لەم بارەیەوە بروانە: كۆمەلْیٚك لە نووسەران، گەلیٚكی پەژموردە...، ل٣٩٧ - ٣٩٨، هەروەها: د. رەفیق شوانی، س.پ، ل٣٣.

لەم چوارچێوەیەدا وەزارەتی پەروەردە لە ساڵی **١٩٩٣** لە ڕێنماییەکانیدا بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگای کەرکوك ڕایگەیاند کە نابێ بێجگە لە عەرەب هیچ ڕەگەزێکی تر لە دامەزراوە پەروەردەییەکانی کەرکووك دابمەزرێ، تەنیا ئەم کورد و تورکمانانە نەبن کە ئەندامن لە حیزبی بەعسدا یان ڕۆڵەی ئەندامانی حیزبن[٨٠]. سەرباری ئەمەش لیژنەی باکوور لە ٤/١/١٩٩٤دا بڕیاریدا بە گواستنەوەی (١٠٦) مامۆستای پیاو و ئافرەتی ناوەندی و ئامادەیی و (**١٥٩**) مامۆستای سەرەتایی لە هەردوو ڕەگەز و (**١٥**) فەرمانبەر لەگەڵ (١٤٦) فەرمانبەری خزمەتگوزار (پاسەوان و بەردەست)، بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکووك کە هەموویان کورد بوون. وە بڕیاریش بوو ئەم کارە قۆناغ بە قۆناغ ئەنجام بدرێت، بەڵام دیارە بەرپرسانی حیزبی بەعس لە کەرکووك داوای دواخستنی ئەم بڕیارەیان کردووە لەبەر ئەوەی گواستنەوەی ئەم ژمارە زۆرەی مامۆستا و فەرمانبەران کەلێنێکی گەورە دروست دەکات و هەروەها لەوە دەترسان ئەم مەسەلەیە کێشەیان بۆ بنێتەوە[٨١].

لە لایەکی تر بەعسییەکان دەیانویست کۆنتڕۆڵی هەموو دیاردە و جموجۆڵێك بکەن لە قوتابخانەکاندا کە بە پێچەوانەی خواست و ئارەزووی شۆڤینستانەی ئەوان بوو، تەنانەت ئەگەر ئەم دیاردەیەی –کە ئەوان بە مەترسییان دادەنا– بریتی بێت لە ئاخاوتنی قوتابیانی کورد و تورکمان و

---

[٨٠] بڕوانە دەقی نووسراوی بەڕێوەبەرایەتی ناوبراو بۆ پارێزگاری کەرکووك لە: hnic Cleansing…, p.55.

[٨١] بڕوانە: Ibid, p.60-61.

سریانی بە زمانی زگماکی خۆیان لە کاتی پشووی نێوان وانەکاندا. ئەوەتا لە ساڵی ١٩٩٩دا پارێزگاری کەرکووك چەند ڕێنماییەکی بەسەر قوتابیانی قوتابخانەکان و مامۆستایاندا سەپاند کە ئەمانەن:

١- قەدەغەیە زمانەکانی کوردی و تورکمانی و ئاشوری و کلدانی لە لایەن مامۆستایان بەکاربهێنرێت لە کاتی وانە گوتنەوە و ڕوونکردنەوەی ڕستە گرانەکان.

٢- نابێ ئەم زمانانە لە لایەن مامۆستایانەوە لەگەڵ قوتابیان بەکاربهێنرێت لە کاتی پشووی نێوان وانەکانیشدا.

٣- نابێ بە هیچ جۆرێ قوتابیانی قوتابخانەکان لە نێوان خۆیاندا هیچ زمانێك جگە لە زمانی عەرەبی بەکاربهێنن[٨٢].

### د- چەوساندنەوەی ئابووری:

بێگومان مانەوەی هەر گروپێکی دیموگرافی یان ئێتنۆگرافی لە ناوچەیەکی جوگرافیدا پەیوەستە بە خاڵێکی بنەڕەتی ئەویش ئەوەیە کە ئەم ناوچەیە تا چەند پێداویستییە ئابوورییەکان و بژێوی ژیانی ئەم گرووپە دابین دەکات، حکومەتی بەعسیش -کە ڕژێمێکی گشتگیر (شمولی) بوو- لە سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی دژ بە کورد لە کەرکووکدا ئەم خاڵەی زۆر بە هەند هەڵگرتبوو، وە بە چەندین ڕێگە هەوڵی دەدا بنەماو بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی کورد لەم دەڤەرەدا لە نێوببات وە ڕەگوڕیشەی کورد لە بنەوە هەڵتەکێنێ، یەکێك لەو ڕێگایانە ئەوە بوو کە دەرفەتی کار لە بەردەم کوردانی کەرکووك کەم

---

[٨٢] د. جبار قادر، م.س، ص٧٩-٨٠.

بکەنەوەو بەڵکو بەرە بەرە نەیهێڵن، بۆیە حکومەتی بەعس بڕیاری دابوو کە ڕەگەزی کورد و هەروەها تورکمانیش لە فەرمانگەکانی دەوڵەت دانەمەزرێن. بەڵام لە هەندێ باری زۆر دەگمەن و لە ناچاریدا ڕەزامەندییان پیشانداوە کە بە پێچەوانەی بڕیارەکە کار بکەن، ئەوەتا پارێزگاری کەرکوك لەبەر کەمی دەستی کارکەر لە نێو ڕەگەزی عەرەبی بۆ ئەوەی بۆشاییەکانی کارگەی مافووری دەستکرد پڕبکەنەوە، سکاڵای بردۆتە بەر لێژنەی باکوور، دیارە لێژنەی ناوبراویش لە نووسراوی ژمارە (١٣٦١/٢)و بەرواری (١٩٩٥/١٠/١٥)دا ڕەزامەندی پیشانداوە کە ئافرەتانی کورد و تورکمان بە شێوەی (استثناء) لەم کارگەیە دابمەزرێن بەڵام (بە مەرجێ دەبێ لە بنەماڵە بەعسییەکان بن و لە لایەن حیزب و ئاسایشەوە پاکانە بکرێن و هەروەها ژمارەیان لە نیوەی ژمارەی داواکراو بۆ دامەزراندن زیاتر نەبێت و بەردەوامیش بن لە هەوڵەکان بۆ ئەوەی نیوەکەی تر بە ڕەگەزی عەرەب پڕبکرێتەوە جا ئافرەت بن یان پیاو) [٨٣]. وە لە بارێکی تریشدا بە ناچاری ڕێگەدراوە کە تەنیا ڕەگەزی تورکمانی بەعسی وەك پاسەوانی شەوانەی قوتابخانەکان دابمەزرێن[٨٤].

مەسەلەکە هەر تەنیا دانەمەزراندنی نەدەگرتەوە بەڵکو هەوڵدرا بە بیانووی جۆربەجۆر ئەو کوردانەی لە فەرمانگەکانی دەوڵەت مابوونەوە دەربکرێن یان بگوازرێنەوە بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك. لە باسەکەی پێشوودا ئاماژە

---

(٨٣) Ethnic Cleansing…, p.71.

(٨٤) بڕوانە دەقی نووسراوی لێژنەی باکوور بۆ پارێزگاری کەرکوك بە ژمارە (٢٠٥/٢٥)و بەرواری (١٩٩٦/٢/١٧) لە: Ibid, p.76.

